# داستانی یاوەران

بەشی دووەم

ئامادەکردنی

باوکی عبداللە

لە بڵاوکراوەکانی رادیۆی دەنگی ئیسلام - هەولێر

١٤١٨ ١٩٩٨

# داستانی یاوەران

## بەشی دووەم

ئامادە کردنی

**باوکی عبداللە**

لە بڵاوکراوەکانی ڕادیۆی دەنگی ئیسلام - هەولێر



والســابقون الأولــون مـــن امهــاجرين
والأنصار والذين اتبعوهم باحسان رضـي
الله عنهم ورضوا عنه واعـد لهـم جنـات
تجري تحتها الانهـار خـالدين فيهـا ابـدا"
ذلك الفوز العظيم

سورة التوبة -١٠٠-




# ئەبو تەلحەی ئەنصاری

**بەدرێژایی ژیانی**
**موجاهیدبوو**

﴿ ٢٠ ﴾

# ئەبو تەلحەی ئەنصاری

## بە درێژایی ژیانی موجاهیدبوو

کاتێک میللەتی ئیسلام بەرەنگاری جەنگێکی چارەنووسی یەکجارەکی دەبێتەوە ، پێشوازی دەکات لە قۆناغی خۆبەستانی سەرتاسەری و بانگهێشتنی سەربازی گشتی ، بەم جۆرە هەر یەکێک لە ئەندامانی ئەم میللەتە دەبێتە سەربازێک بەکارێک لە کاروباری جەنگ هەڵدەستێت و ، بەشداری تێدا دەکات ، ئینجا ئەم کارە چ بەشداری کردن بێت لە گۆڕەپانی جەنگ ، یان هاوکاری موجاهیدان بێت لە ئامادە کردنی چەک و تەقەمەنی و ، چاودێری ماڵ و منداڵیان و ، یان پاسەوانی شت و مەک و ناودانی موجاهیدان و چارە سەری نەخۆش و بریندارانی جەنگ ، یان هەر کاروبارێک پەیوەندی هەبێت بەخزمەت کردنی جەنگ . . .

پێویستە لە سەرمان ئەم ئایەتە پیرۆزەی سورەتی (توبـة) لە یادنەکەین ، کەدەفەرموێت : [ انفروا خفافا" وثقالا" وجاهدوا بأموالكم وانفسكم في سبيل الله ذلكم خير لكم ان كنتم تعلمون ] . . . واتە : خێرا بن و دەرچن بۆ بەشداری کردن لە جیهاد بەهەموو توانایەک ولەهەر جێگایەک هەن ، وەلەهەر تەمەنێک بن : گەنج یان پیر ، پیادەبن یان بە سواری ، بەهێز بن یان بێ هێز ، هەژار بن یان دەوڵەمەند . . . .

لەبەر ئەوە دەبینین ئەبو تەلحەی ئەنصاری خوا لێی ڕازی بێت ، بە درێژایی ژیانی هەر لە جیهاد و تێکۆشان بوو ، کاتێک پرسیاریان لێ دەکرد دەربارەی ئەمە ، وەڵامی دەدانەوەو دەیگووت ، گوێم لێبووە خوای گەورە فەرموویەتی (انفروا خفافا" وثقالا") . . . منیش یەکێکم لەمانە (خفاف) یان (ثقال) . . . .

کاتێک سەعیدی کوڕی مەسیب (خ.ل) هەر لە جیهاد دابوو ، چاوێکی لە دەست دا بوو . . . پێیان گووت : تۆ شکستی و خاوەن پاساوی ، جیهادت لەسەر نیە ، ئەویش وەڵامی دەدانەوەو دەیگووت : خوای گەورە بانگی بەهێزو بێ هێزی کردووە ، دەبێت هەر بۆی دەربچم ، ئەگەر جیهادیشم پێ نەکرا ، ئەوا بۆرایی زیاد دەکەم و ، دەبمە پاسەوانی شت و مەک . . . . .

ئا ئەوەیە مێژووی زێرینی ئیسلامی مەزن ، نموونەیەک لە نموونە ئاساکانی موجاهیدە بە وەفاکانمان پێشکەش دەکات ، ئەویش ئەصحابەی بەڕێزی کۆڵ نەدەر ئەبو تەلحەی ئەنصارییە . . ناوی تەواوی :ـ زید کوڕی سهل کوڕی أسود کوڕی حزام کوڕی عەمرو کوڕی زەید کوڕی منات کوڕی عەدی کوڕی مالک کوڕی نەجار . . . .

ئەبو تەلحە یەکێک بوو لە پێشەنگەکانی خەڵکی مەدینەو ، گوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەری کردو . . . پەیمانی عەقەبەی بینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ، پێغەمبەر ﷺ

برایەتی خستە نێوان ئەبو تەلحە وئەبو عوبەیدەی کوڕی جەراح . ئەبو تەلحە وا ڕاهاتبوو ، هیچ دیمانێک لە دیمانەکانی جیهادی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لەدەست نەدا ، هەر لە جەنگی بەدرەوە تاکو هەموو دیمانەکانی تر . . ئەبو تەلحە یەکجار بلیمەت و زانا بوو لە بەکارهێنانی تیروکەوان . کاتێک ئەبو تەلحە تیرێکی دەهاوێشت پێغەمبەری خوا ﷺ سەری بلند دەکرد بۆی و تەماشای تیرەکەی دەکرد تاکو بزانێت تیرەکە لەکوێ دەکەوێتەوە . . . بەم جۆرە پێغەمبەر ﷺ زۆر سەر سوڕمان بوو بە بلیمەتی و زیرەکی ئەم پیاوە . . .

ئەبو تەلحە سوارچاکێک بوو زۆر گرنگی دەدا بە پەروەردەی ڕەشەنی ولاخ ، بە مەبەستی بەکارهێنانی بۆ گۆڕەپانی جیهاد ، نەک لە پێشبرکێی قومارو ئارەزوو ، زۆر جاران پێغەمبەر ﷺ سواری ولاخەکەی ئەبو تەلحە دەبوو ، زۆر سەر سوڕمان بوو بە پەروەردەی ئەم ولاخەو دەیگووت : (من ئەم ولاخەم بینی وەک دەریایەک واتە ئەوەندە بە نەرمی وخێرایی دەڕوات . . . . )

ئەبو تەلحە خۆی دوچاری کوشتن دەکرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە ڕۆح وگیانی ، هەروەک سیرە بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت :

[ ئەبو تەلحە ببوە پەرژینێک لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا خۆی دەدا بە کوشت . . . ئەبو تەلحە ببوە قەڵغانێک بۆ پاراستن و بەرگری لە پێغەمبەری خوا ، لە پێشەوەی تیری دەهاوێشت ، لە کاتی جەنگی ئوحدیش ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا بریندار ببوو ، پێغەمبەر ﷺ تیرو کەوانی بۆ ئامادە دەکردو تیری بۆ کۆدەکردەوەو ، دەیدا بە ئەبو تەلحە ، تاکو بەبێ پچڕانەوە لە سەر تیرهاوێشتن بەردەوام بێت . . . .

(ابن سید الناس) لە پەرتووکەکەی (عیون الاثر) بۆمان باس دەکا دەربارەی ئەو کارەساتەی بەسەر ئەبو تەلحە دێت ڕۆژی ئوحد . . . . چۆن دەچەسپێ و جیهاد دەکاو کۆڵ نادات ، جیهادێک دەکات لەسەروەی توانای خۆی ، هەروەک ئەبو تەلحە خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت :- باوشک و خەو دەیبردینەوە کاتێک لەناو سەنگەر بووین ڕۆژی ئوحد ، هەتا شمشێرەکەم لەدەست دەکەوتە خوارەوەو ، هەڵم دەگرتەوە ، دووبارە لە دەستم دەکەوتە خوارەوەو ، هەڵم دەگرتەوە ، ئەم ڕۆژە ڕۆژی بەڵاو تاقیکردنەوە بوو ، خوای گەورە ڕێزی دەنا لە موسڵمانان بەشەهادەت ، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ لەدەست دوژمنان ڕزگاری بوو . . .

لەبەر تێکۆشان و کۆڵ نەدانی ئەبو تەلحە ، پێغەمبەرمان ﷺ دەرهەقی دەفەرمووێت : [ دەنگی ئەبو تەلحە لە لەشکردا چاکترە لە سەد کەس ] . . . .

ئەبو تەلحە خێزانێکی مسوڵمانی موجاهیدەی هەبوو ، ناوی (أم سلیم کچی ملحان) بوو ، پێش ئەبو تەلحە خێزانی باوکی (أنس کوڕی مالک) بوو . (أبو نعیم) لە پەرتووکی (الحلیە) دا باسی دەکاو دەڵێت :-

[ مەلّ کەچ بوو بۆ فەرمانی خۆشەویست ، بریندار کەر بوو لەشەڕو ڕووداوانەدا ، وە

پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی دەفەرمووێت :-
[ من خۆم بینیم چووە بە هەشت ، چاوم بە (رمیصاء) ی خێزانی ئەبو تەلحە کەوت ] .
ئەم ئافرەتە بەڕێزە پێویستە گەورەیی بزانین کەوا پێشی پیاوەکەی ئەبو تەلحە بووە مسوڵمان ، کاتێک هات بۆ داخوازی (أم سلیم) ، (أم سلیم) پی‌ی گووت :-
[ من بەتۆ ڕازیم ، لە تۆ چاکترم بەدەست ناکەوێت ، بەلام تۆ پیاوێکی گاوری و ، منیش ئافرەتێکی مسوڵمانم ، ئەگەر ببی بە موسڵمان ، موسڵمانیەکەت دەبێ بە مارەیم ، لەمە زیاتر داوات لێ ناکەم ، من نەداوای زەردت لێ دەکەم نەسپی ، من مسولمان بوونم لە تۆ دەوێ ، ئەگەر ببیە مسولمان مێردت پێ دەکەم ] ...
ئەبو تەلحە تۆزێک ماوە ، پاشان سینگی جۆش درا بە ڕوناکی ئیسلام و ، چووە لای پێغەمبەر بۆ ئاشکرا کردنی مسولمان بوونی ، کاتێک پێغەمبەر ﷺ بینی وا بەرامبەری دێت بە ئەصحابەکانی دەورو بەری گووت : [ ئەبو تەلحە هات بۆ لاتان عیززەت و سەر بڵندی ئیسلام لە ژێر دەستی ئەوە ] ....
(ئەبو تەلحە) بانگی شەیادی بە : (لاالە الأ اللە محمد رسول اللـە)دا ، بووە موسڵمان ئیسلامیش بووە مارەیی خێزانەکەی ، هەروەک هەندێکیان دەڵێن [ نەمانزانی هیچ مارەیی یەک گەورەتر بێت لەم مارەیی یە ، کەوا ئەم ئافرەتە ڕازی بوو بە مارەیی ئیسلام بوونی ، مێردی پێ کرد ...
(أم سلیم) ژیانێکی درێژ ژیا لەگەڵ پیاوەکەی کە ئەبو تەلحە بوو ، کەوا دڵسۆزی خۆشەویستی وهێمنی و دەسپاکی ئەم ژیانەی ڕازاندبوونەوە ، هەروەک لە صحیح بوخاری هاتووە کەوا پیاوێکی ئەنصاری دەڵێت : (من نۆ منداڵم لە ئەبو تەلحە دیوە هەموویان قورئان خوێن بوون) ...
(أم سلیم) ئافرەتێکی یەکجار ژیرو لەخوا ترس و بڕوادار بووە ، وا دەگێڕنەوە کەوا منداڵێکی دەبێت لە ئەبو تەلحە ، منداڵەکە دەمرێ و ئەبوتەلحە لە دەرەوەی ماڵەوە دەبێت ، دایکی منداڵەکە لە نزیک ماڵەوە دەیشارێتەوەو بەخاکی دەسپێرێ ، کاتێک پیاوەکەی دەگەڕێتەوە ماڵەوە پرسیاری منداڵەکە لە دایکی دەکات (أم سلیم) پی‌ی گووت :- چۆنی بڵێیت باشە ، پاشان خواردنی بۆ هێناو خواردی و ، پاشان خۆی بۆ ڕازاندەوەو سەرجێی بۆ کرد ، کاتی بەیانی ئافرەتەکە بە ئەبوتەلحەی گووت :-
ئەی ئەبوتەلحە ، ئەت بینیوە فلانە کەس کاتێک ڕاسپاردەک وەردەگرن بۆ ئەوەی سوودی لی ببینن ، کاتێک خاوەنەکەی داوای ڕاسپاردەکە دەکاتەوە لە دڵیان گران دەبێت . ئەبوتەلحە گووتی :- ئەمە شتێکی ڕاست نیە ... ئافرەتەکە گووتی :- کوڕەکەت ڕاسپاردەبوو لە لایەن خوای گەورە ، ئێستاش خوای گەورە ڕاسپاردەکەی داوا کردەوەو بۆ خۆی بردەوە ، بەم جۆرە ئەبو تەلحە ئارامی گرت و پەندی لەم شتە وەرگرت .....
کاتێک ئەبوتەلحە ڕۆیشتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی بەیانی پێغەمبەر پی‌ی فەرموو : [ ئەی ئەبا تەلحە ، خوا ئەم شەوەتان پیرۆز بکات ] ...

( أم سليم ) لەم شەوەدا سکی بوو بە منداڵێک بەناوی عبدالله .
( أم سليم ) بەشداری جەنگی حونەینی کرد لەگەڵ مێردەکەی ، بەدەستی ڕاستی خەنجەرەکەی گرتبوو ، وەبەدەستی چەپەی ووشتری مێردەکەی .. وادەگێڕنەوە کاتێک ئەبوتەلحە چاوی بە خەنجەرەکەی دەستی دەکەوێ ... پێی دەڵێ : ئەمە چی بە لە دەستت ئەی ( ام سليم ) ؟
أم سليم دەڵێت :- ئەمە خەنجەرە هەڵمگرتووە ، ئەگەر یەکێک لەبێ باوەڕەکان لێم نزیک بۆوە ، ورگی هەڵدەدڕم ... ئەبوتەلحە گووتیە پێغەمبەر :- ئەی پێغەمبەری خوا ، گوێت لی نیە أم سليم چی دەڵێت !! ئەوها ئەوها دەڵێت .. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :- [ ئەی أم سليم ، خوای گەورە باشی هێناوە ئەمە بەسە ]
ئەنەسی کوڕی مالیک وادەگێڕێتەوە :- ڕۆژی ئوحد بینیم عائیشەو أم سليم ، خۆیان گورج کردبوو ، خرخاڵی پێیان دیار بوو ، مەشکە ئاوەکانیان لەسەر ملی خۆیان دانابوو ، بە تالیان دەکردو دەیاندا بە موجاهیدەکان ، دووبارە دەگەڕانەوە و پڕیان دەکردەوەو دەیاندا موجاهیدان ..
أبو نعيم لە ( الحليه ) وادەگێڕێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ نەچوێتە هیچ ماڵێک لە ماڵەکان لە شاری مەدینە بێجگە لە ماڵی ( أم سليم ) نەبێت ، کاتێک پرسیاریان لی کرد دەربارەی ئەمە فەرمووی :- [ من بەزەییم پێی دێتەوە ، برایەکەی لەگەڵ من کوژراوە ] ...
( أم سليم ) پێغەمبەری خوای بەرادە بەدەر خۆشویستووە ، یەکێک لەم دیمانانە کەوا أبو نعيم بۆمان دەگێڕێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی نیوەڕۆ خەوی لی کەوت لە ماڵی ام سليم .. پەرداخێکی هێنا بۆ کۆکردنەوەی عەرەقی لەشی پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پێغەمبەر لەخەو هەڵسا بینی أم سليم چی دەکات ، فەرمووی ئەی أم سليم :- چی دەکەیت ؟
أم سليم گووتی :-[ ئەوە عەرەقی تۆیەو لەناو شتی خۆشی دەکەم ، ئەم عەرەقە خۆشترین بۆنە ] ...
لەگەڵ ئەوەی ئەبوتەلحە پیاوێکی خوا پەرست بوو ، هەروەها پیاوێکی چاوکراوە بوو بۆ کاروباری ژیان ، هەروەک ئیمام بوخاری دەگێڕێتەوە و ڕیوایەت دەکات لەهەموو ئەنصاریەکان زیاتر دارخورمای هەبووە ، وە خۆشەویسترین ماڵ لەلای زەویەک بوو بە ناوی (بیرحاء) ، ئەمەش زەوی یەکی زۆر بە پیت و بەرەکەت بوو لە نزیک مزگەوت ، لەشاری مەدینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەچووە ناوی و لەئاوە صاف وبێ گەردو پاکەکەی دەخواردەوە .
کاتێک ئایەتی خوای گەورە لە سوڕەتی آل عمران هاتە خوارەوە :- (لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون ، وما تنفقوا من شيء فان الله به عليم) . ئەبوتەلحە بە پێغەمبەری گوت :- ئەی پێغەمبەری خوا ، خوای گەورە میهرەبان دەفەرموێت :(لن

تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون) .
واته :
کەواتە من خۆشەویسترین ماڵ لەلام (بیرحاء )یە ، ئەوەش خێرێکە بۆ خودا ، تکام وایە تێیبەخشم و لای خوا کۆی بکەمەوە ، ئەی پێغەمبەری خوا خۆت بیبەخشە چۆن خوا خێری دەکات ...
پێغەمبەر ﷺ بەسەر سوڕمانەوە فەرمووی : (ئای لەمە ، ئەم ماڵە قازانجە ، ئەو ماڵە قازانجە ، گوێم لی بوو چیت گووت ، من وام پێ باشە بیبەخشی بە خزمەکانت) .
ئەبوتەلحە فەرمووی :ـ دەیکەم ئەی پێغەمبەری خوا ...
پاشان ئەبوتەلحە دابەشی کرد بەسەر خزمەکانی و کوڕە مامەکانی هەروەک پێغەمبەر ﷺ ڕێگای پێ نیشان دا...
ژیانی ئەبوتەلحە ئەوەندەی بڵێی درێژ بۆوە ، لەگەڵ ئەمەشدا هەر جیهادی کرد ، بە درێژایی ژیانی پێغەمبەر هەر جیهادی کرد تاکو پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کرد ، پاشان ئەبو تەلحە بەدرێژایی ژیانی خەلافەتی ئەبوبەکریش جیهادی کرد تاکو . ئەبوبەکریش کۆچی دوایی کرد ، پاشان بە درێژایی خەلافەتی تیمامی عومەریش جیهادی کرد تاکو ئەویش کۆچی دوایی کرد ...
پاشان ئەبوتەلحە کۆچی کرد بۆ شام وەکو موجاهیدێکی کۆڵ نەدەر ، بەردەوام ئەم ئایەتەی خوای گەورەی دووبارە دەکردەوە :(اانفروا خفافا" وثقالا") پاشان وەکو موفەسیرێک دەیگووت :ـ[ پیرو گەنج ، خوا گوێ ناداتە پاساوی کەسێک ] .
پاشان بە مندالەکانی دەگووت :[ ئەی کوڕەکانم ، دەبینن خوای گەورە بانگهێشتی پیرو گەنج دەکات ، ئامادەم بکەن بۆ جەنگ ...
کوڕەکانی پێیان گووت :ـ خوا ڕەحمت پێ بکات ، غەزات کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ تاکو کۆچی دوایی کرد ، وەلەگەڵ ئەبوبەکریش تاکو مرد ، وەلەگەڵ عومەریش تاکو مرد ، ئیتر پشوو بدەو ئێمە لە جێگای تۆ غەزا دەکەین !! بەلام ئەبوتەلحە قەبولی نەکردو ئەم دروشمەی گووتەوە :ـ[ انفروا خفافا" وثقالا" ] ..
پاشان ئەبوتەلحە لەگەڵ کەتیبەی بڕوادار دەرچوو بە سواری کەشتی بۆ بەرز کردنەوەی بانگی خوا لە وشکایی و دەریا ، بەم جۆرە مایەوە لە ڕێگای تێکۆشان تاکو گەیشتە لای پەروەردگار ئەبوتەلحە لەناو دەریای بێ سەرەتاو کۆتابوو ، ئەوەبوو هاوڕێکانی نەیانهێشت تەنها لە ووشکایی بیشارنەوە ، هیچ دورگەیەکیان نەدیتەوە بۆ ئەوەی بیشارنەوە تەنها پاش نۆ ڕۆژ نەبێت ، لەدورگەیەکیان شاردەوە ، مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا لاشەکەی هیچ نەگۆڕاو بۆنی نەگرت لەم ماوەیەدا ...
ئیتر بەم جۆرە لە ناوەندی ئاوو هەواو ئاسمان ژیانی جیهادی ئەبوتەلحە کۆتایی پێ هات کەوا بە درێژایی ژیانی لە جیهاددا بوو ..
ئەبوتەلحە لەسالی سی و دوو ، هەندێکیش دەڵێن سی و چواری کۆچی کاتێک

تەمەنی گەیشتبووە حەفتا ساڵ کۆچی دوایی کرد ...

ڕەحمەتی خوا لە موجاهیدی وشکایی و دەریایی ئەبوتەلحە ئەنصاری بێت ، کەوا بە درێژایی ژیانی جیهادی لە پێناوی بەرز کردنەوەی ووشەی لاالـە الا اللـه محمـد رسـول الله بەخت کرد .

٢١

# حوزەیفەی کوڕی یەمان

## دوژمنی دووڕوویی ودۆستی ڕاستی وبێپەڵەیی

﴿ ٢١ ﴾

# حوذەیفەی کوڕی یەمان

## دوژمنی دووڕوویی ودۆستی ڕاستی وبێپەڵەیی

خەڵکی مەدائین بە کۆمەڵ دەهاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی پێشوازی لە فەرمانڕەوای نوێیان بکەن ، کەوا ئەمیری مسوڵمانان عومەری کوڕی خەتاب بۆی هەڵبژاردبوون ... دەرچوون و ، زۆربە پەرۆش بوون بۆ بینینی ئەو ئەصحابە بەڕێزە ، کەوا بە مل کەچی بۆ خواو ترسان لە خوا بە ناوبانگ بوو ، گوێ یان لی ببو کەوا دەستێکی بالای هەبوو لە فەتح کردنی عێراق ........

چاوەڕوانی ئەم ئەستێرە گەشە ڕەوانە کراوەیان دەکرد ، لە پێشیان پیاوێکی نورانی بە دیار کەوت ، سواری گوێ درێژەک ببوو ، کورتانێکی کۆنی لەسەر پشتی بوو پیاوەکە هەردوو پێیەکانی دەهێناو دەبرد ، بەهەردوو دەستەکانی ئەستوکێکی نانی لەگەڵ هەندێک خوێ بەدەستەوە گرتبوو و ، نانی کەرت دەکردو دەیخوارد ..!!

کاتێک ئەم پیاوە گەیشتە ناویان ، زانیان ئەمە (**حوذەیفەی کوڕی یەمان**) یە ئەم والیەی کەوا چاوەڕوانیان دەکرد ، عەقل و هۆشیان لەگەڵی باڵی گرت ...!!

بەلام ، لەچی سەریان سوورما ...!!

لەگەڵ ئەوەش دەبوایە گومانی وانەبەن ، ئەگەر عومەر یەکێک هەڵبژێرێت دەبێت چۆن بێت .. ؟!

بەڕاستی هەقی خۆیان بوو ئەم گومانە ببەن ، چونکە نەلەکاتی فەرمانڕەوایی فارس و نەلە پێش فەرنڕەوایی فارسەکان چاویان بەم چەشنە والی یە بەڕێزە نەکەوتبوو ..!!

**حوذەیفە** گەیشتە جێو ، خەڵکەکە لە دەورەی کۆبوونەوە ...

کاتێ بینیان چاویان بڕیبوو لێی و ، دەتگووت چاوەڕێی قسەی لێ دەکەن ، ئەویش تەماشای ئەوانی دەکردو یەک یەک تەماشای دەکردن .. پاشان فەرمووی :

[ ئاگادار بنەوە لە نیشانەکانی خراپە ] ..

گووتیان : نیشانەکانی خراپە چی یە ئەی باوکی عبدالله .. ؟

فەرمووی [ دەرگای ئەمیرەکان .. کاتێک یەکێکتان دەچێتە لای ئەمیرێک یان فەرمانرەوایەک ، بڕوا بە درۆیەکانی دەکات و پێیدا هەڵدەلێ بەبێ ئەوەی ئەم سیفەتەی تێدا هەبێ ] ...!! ، یەکسەر خەڵکەکە لەم پێشەکی یەی والی نوێیان گەیشتن ، کەوا لە دونیا لە هەموو شتێک زیاتر ڕکی لە نیفاق و دوو ڕوویی دەبێتەوە ........

هەروەها ئەم سیفاتە گەورەترین ڕاستی یەکەوا تەعبیر لە کەسایەتی فەرمانڕەوای نوێیان دەکات ...

**حوذەیفەی کوڕی یەمان** پیاوێک بوو سرووشتی ژیانی وا ڕاهاتبوو کەوا ڕکی لە

دووڕوویی دەبۆوە ، توانایەکی بێ ئەندازەی هەبوو پێش ئەوەی خراپە لە شوێنی خۆی سەر هەلبدا . .
هەر لەو کاتەی خۆی و براکەی صفوان و باوکی هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەر سێکیان ئیسلامیان وەرگرت ، ئیسلام ڕۆناکی و ڕەونەقی ئەم بەخششەی زیاتر کرد . . . .
ئیسلامێکی بەهێزو پاک و پتەوی وەرگرت . . . زیاتر ڕکی لە ترسنۆکی و درۆو دووڕوویی بۆوە . . لەسەر دەستی ئەم پێغەمبەرە پەروەردە بوون و ، هەروەک ڕۆشنایی سووری بەیانی ، ڕاستگۆیی و ئەمینی یان لی دەبینی و بینیان پیاوی ڕاستی خۆش دەوێ و ، وەرکی لە ڕیابازان و فێلبازان دوو ڕووان دەبێتەوە . . . !!
ئەم شوێنەش باشترین جێگا بوو بۆ حوذەیفە کە ئەو بەخششەی پێی بەخشرا بوو گەشە بکات و بگەشێتەوە ، ئەم شوێنەش ئایینی ئیسلام بوو ، لە ژێر دەستی پێغەمبەر و ، ناوەڕاستی ئەم پۆلە ئەصحابە بەڕێزە بوو . . . .
ئینجا بەڕاستی ئەم بەخششەی خوا پێی دابوو بە باشترین گەشە گەشەی کرد . . . تایبەتمەندی وەرگرت لە خوێندنەوەی هەندێک نهێنی لە دڵ و دەروون ، خوای گەورە جۆرە کەرامەتێکی دا بە حوذەیفە هەر کە تەماشای دەم و چاوی مرۆڤی دەکرد دەیزانی ئەمە ڕەنگ دانەوەی ناو دڵ و دەروونیەتی و دەیخوێندەوە . .
هەتا وای لی هات ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) لەگەڵ ئەوەی زۆر زیرەک و بە بیروهۆش بوو ، لە بیروڕاکانی بیروڕای حوذەیفەی وەردەگرت ، لەبەر بیر تیژی لە تێڕوانینی خەلک و ناسینیان . . .
حوذەیفە بەزیرەکی خۆی وای دەڕوانی کەوا چاکە زۆر ئاشکراو ڕوونە لە ژیانی مرۆڤ ئەوەی بیەوێت ، بەلام خراپە شاردراوەیە وخۆی دەگۆڕێ ، لەبەر ئەوە مرۆڤی عاقڵ پێویستە پێدا چوونەوەی خراپە بکات بزانێ لە کوێ هاتووە ، چۆن پەیدا دەبێت . . !!
بەم جۆرە حوذەیفە پێدا چوونەوەی کردووە ، بە خراپە و پیاو خراپان و دوو ڕووان . . هەروەک دەڵێت :- [ خەلک پرسیاری چاکەیان دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەلام من پرسیارم دەکرد دەربارەی خراپە لە ترسی ئەوەی نەوەکو منیش بگرێتەوە . . . (گووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، ئێمە لە نەزانی و خراپە دابووین ، خوای گەورە ئەم چاکەی بۆ ڕەوانە کردووین . . ئایا لە پاش ئەم چاکەیە هیچ خراپەیەک هەیە . . . ؟
فەرمووی : بەلێ . . . .
پێم گووت : ئایا لە دوای ئەم خراپەش هیچ چاکەیەک هەیە . . . ؟
فەرمووی : بەلێ ، ئەم خراپە کاری یە چەند نیشانەیەکی هەیە . . .
گووتم : ئەم نیشانانە چین . . . ؟ ؟
فەرمووی : میللەتێکن بێجگە لەڕێگای من ڕێگایەکی تر دەگرن ، خەلک بانگ دەکەن

بە ڕێگایەکی تر بێجگە لە ڕێگای مـن ، ئـەو کردەوانـەیان دەناسـی و دژیـان ڕادەوەستی . . .
پێم گووت : ئایا پاش ئەم خێرە هیچ شتێکی خراپ هەیە . . . ؟ ؟
فەرمووی : بەلێ ! چەند بانگەوازکارێک لەسەر دەرگاکانی دۆزەخ ، هەر کەسێک بە گوێیان بکات فڕێی دەدەنە ناوی . . .
گووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، چیم فەرمان پێ دەدەیت ، ئەگەر تووشی ئەمە بووم . . . . ؟
فەرمووی : دەست بە کۆمەڵی مسوڵمانان و پێشەواکەیان بگرە . . .
گووتم :ئەگەر کۆمەڵ و پێشەوایان نەبوو ؟ ؟
فەرمووی : واز لەم چین وکۆمە لانە هەموو بهێنە ئەگەر بەددانت ئەم دارە بگری وەتا مردن دەتگا تێ و تۆ لە سەر ئەم حاڵە بیت . . . . . !!
بەلێ بەم جۆرە بینیتان خەلک پرسیاری چاکە وخێر لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و ، **حوذەیفە** ش پرسیاری خراپە دەکات لە ترسی ئەوەی نەوەکو ئەو بگرێتەوە . . . . (**حوذەیفەی کوڕی یەمان**) ژیانی بەم تێڕوانین وچاوتیژیە بردە سەر لەگەڵ هاتنی ئەم هەموو بەلاّیانە وچۆنیەتی ڕێگای خۆپاراستن لێیان و ، وەئاگادارکردنەوەی خەلک لێیان. ئەم بەخششەی کەخوا پێی دابوو دونیای پێ دەبینی و ،خەلکانی پێ هەلدەسەنگاندو . . . . هەروەها پرسیار ومەسائیلەکانی لە بیرو هۆشی بە شێوەی فەیلەسوف و زیرەکی حەکیم ڕادەپەڕاند. . . .
پیاوێک لەم جۆرە چەشنە بێت، دەبێت بڕوایی یەکی بە تین . . . . .گوێڕایەلیەکی پتەوی هەبێت بۆ ئیسلام ،کاتێک بینی باوکی لە شەڕی ئوحد شەڕی دەکرد، مسوڵمانێک بە هەلە شەهیدی دەکات وا دەزانێ یەکێکە لە بێبڕواکان. . . . .!!!
**حوذەیفە** وا ڕێکەوت لەو کا تە ئاوڕی دایە وە ،بینی بە شمشێر لێی دەدرێت ،هاواری کردەسەر ئەو کەسەی لێی دەدا :باوکمە ، باوکمە ، ئەوە باوکمنە . . . !! ، بەلاّم قەزاوقەدەری خوا تەواوی کردبوو. . . . .کاتێک مسوڵمانان ناسیانەوە زۆر خەمیان بۆ خوارد ،بەلاّم بە بەزەیی و لێ خۆش بوونەوە تەماشای کردن و ،گووتی:
(خوا لێتان خۆش بێ ، هەر خۆی لە هەموو کەس بە بەزەیی ترە ) . . . .
پاشان بەخۆی وشمشێرەکەیەوە ڕووی کردەوە ناوەندی جەنگ ودەستێکی باشی لە دوژمنانی خوا وەشاندو فەرمانی خوای بەجێ گەیاند . . . کاتێک جەنگ کۆتایی پێ هات ئەم دەنگوباسە بە پێغەمەری خوا ﷺ گەیشت ،فەرمانی کرد بە بەخشینی خوێن بۆ باوکی **حوذەیفە** (حوسەیل کوڕی جابر) . . .خوا لێی ڕا زی بێت ،بەلاّم **حوذەیفە** ئەم خوێنەی وەرنەگرت، بە خشیەوە سەر مسوڵمانان ،پێغەمبەر ﷺ زیاتر خۆشی ویست وڕێزی لێ گرت.
بڕوایی وگوێ ڕایەلی **حوذەیفەی** بۆ ئیسلام ، نەیاندەزانی شکستی وبێ هێزی مانای

چی یە .....

لە جەنگی خەندەق.... پاش ئەوەی شکستی پەیدابوو لە گاورەکانی قورەیش و هاوپەیمانەکانیان لە جولەکەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی بوەستێ بەرامبەر کۆتا هەلوێست وباری دوژمنان لە سەربازگەکانیان ...

لەم ڕۆژەدا شەو زۆر تاریک و ترسناک بوو، باومژ ئەوەندە بەهێزبوو هاوارو دەنگی لێ هەلدەستا ،دەتگووت دەیەوێت چیاکانی بیابان لە ڕەگەوە هەلکێشێت .......

بەلێ بارودۆخ لەگەلّ ئەم هەموو ئابلۆقە وعینادی گاورەکان بەمانەوەیان لەدەورەی مەدینەو دروست بوونی ترسێکی زۆر لە دەروونی خەلک ، برسیەتی بەرادەیەدەر تینی هێنابووە سەر هاوەلەکانی پێغەمبەر ﷺ ،تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ خودی خۆی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ دەمی بەخواردن نەکەوتبوو، هەتا وای لێ هاتبوو بەردی بەسکی خۆی بەستبوو ئنجا لێرەدا چ هێزێک هەیە ، بچێت بۆ ناوەندی سەر بازگەی دوژمن و ئەم هەموو بۆسەو ترسە ببڕێت، بچێت دەنگوباسی دوژمن بهێنێت .... ؟؟

پێغەمبەر خۆی ئەو کەسە هەلدەبژێرێت لە هاوەلەکانی بۆ ئەوەی بەم کارە گرنگە ناخۆشە هەلبستێت....

دەبێت ئەم قارەمانە کێ بێت ........ ؟؟؟؟

بەلێ ئەم قارەمانە .... **حوذەیفەی کوڕی یەمانە**.....

پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد ئەویش بەبێ گرێ گووتی بەلێ ، هەروەک خۆی بۆمان دەگێرێتەوە ، دەلێت نەم توانی بلێم ناتوانم ئەم کارەبکەم ، لەبەر ئەوەی ئەم کارەم بەواجب زانی ، وە لە ئەنجامەکەشی دەترسام ،کەوا لە ژێر ئەم برسیەیە کوشندەیەو ئەم سەرما توندەو ماندووبوونە زۆرە ، کەوا بەهۆی ئەم ئابلۆقەیەی گاورەکان لە سەریان دانابوو ، نزیکەی مانگێک بوو.....

ئەم کارەی **حوذەیفە** لەم شەوەدا جێگای سەر سوڕمانە ........

**حوذەیفە** توانی لەم شەوەدا ماوەی نێوان ئەم دوو سەر بازگەیە ببڕێت و ، بەناو ئەم ئابلۆقەیەدا بڕوات و .... بچێتە ناو سەربازگەی قورەیش ، کاتێ بینی ئەم ڕەشەبا توندە ئاگرەکانی سەربازگەکەی کوژاندەوەو تاریکی بەسەر هێنان ، **حوذەیفە** (خوا لێی ڕازی بێت) گەیشتە ناوەندی ریزەکانی جەنگاوەرەکانیان.....

ئەبو سوفیان سەرۆکی قورەیش ترسا لەوەی نەوەکو ئەم تاریکیە وایان لێ بکات مسولمانەکان دەرفەت وەرگرن بچنە ناویان ، هەستا سوپاکەی ئاگادار کردەوە........

**حوذەیفە** گوێی لێ بوو ئەبو سوفیان بە دەنگی بەرز هاوارای دەکرد :

ئەی کۆمەلی قورەیش ،هەر کەسێک تەماشای ئەوەی تەنیشتە خۆی بکات ،هەروەها دەستی بداتێو ، ناوی بزانێت ...

**حوذەیفە** گووتی :

پێش کەوتم دەستم برد بۆ ئەوەی تەنیشتم ،پێم گووت ،تۆ کێی ... ؟؟؟

ئەویش گووتی: فلانی کوڕی فلانم....!!
بەم جۆرە حوذەیفە خۆی ڕزگار کرد لە ناو سوپاکەو ،سەلامەت دەرچوو !!
ئەبوسوفیان لەسەر ووتارەکەی خۆی بەردەوام بوو پاشان گووتی : (ئەی کۆمەڵی قورەیش سوێند بە خوا ئێوە لە شوێنێکی جێگیرنین ، وولاخ و ووشترەکانتان فەوتان ، بني قريظة ڕاستیان نەکرد لەگەڵمان و ،ئەم هەواڵانەی کە پێشمان دەگا بە دڵی ئێمە نیە ، تووشی ئەم ڕەشەبا بە هێزە بووین ، هیچ توانایەکمان نەما ، ناتوانین ئاگرهەڵگیرسێنین و ، هیچ شتێک بەسەر یەکەوە بنێین ، باربکەن ،من کۆچ دەکەم و دەڕۆم ...
پاشان هەڵساو سواری ووشترەکەی بوو ، دەستی بە ڕۆیشتن کرد ، جەنگاوەرەکانیش بەدوایدا ڕۆیشتن ....
حوذەیفە دەڵێت :
(ئەگەر پەیمانم لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرنەگرتبایە کەوا پێی گووتبم هیچ شتێک نەکەی هەتا دە گەڕێیەوە لام ، ابو سوفیانم بەتیرێک دەکوشت ).....
حوذەیفە گەڕاوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دەنگوباسەی پێ ڕاگەیاندو ئەم مزگێنیەی دایێ ....
ئەو کەسەی تەماشای حوذەیفە دەکات ،تەماشای بیروهەست وفەلسەفەو زانستی دەکات لەو باوەڕەدا نیە کەچ جۆرە قارەمانێکە لە گۆڕەپانی شەڕوجەنگدا ....
لەگەڵ ئەمەشدا ، حوذەیفە لەم بوارەدا پێچەوانەی ئەم تێروانینەیە......
بەڵێ پیاوی (مزگەوت) و خواپەرست ، هەتا ئەو کاتەی شمشێرە کەی هەڵدەگرێ ڕوویەڕووی سوپاسی بت پەرستی تاریکی دەبێتەوە ئنجا ئازایەتی بەدیار دەکەوێ ئەو کاتە مرۆڤ سەرسام دەکات ..... دەبێت ئەوەش بزانین ، حوذەیفە یەکێکە لەوسێ کەسانەی یان پێنج کەسانەی ، کەوا سەرکردایەتی عێراق وفارسیان کردووە....
(هەمەدان)و (ڕەیی)و( دەینەوەر) ، لە سەر دەستی ئەمانە ڕزگار بوو......
لە جەنگی (نهاوەند)ی مەزندا ، کەوا فارسەکان بەسەدوپەنجا هەزار جەنگاوەر کۆمەڵەیان کردبوو ،ئەمیری بڕواداران عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازیبێت) نەعمانی کوڕی موقەڕینی هەڵبژارد بۆسەرکردایەتی سوپای مسوڵمانان، پاشان بۆ حوذەیفەی نووسی کەوا بە سەرکردایەتی سوپاکەی لە کوفە بگاپێی... عومەر بۆ موجاهیدەکانی نووسی و بۆی ڕەوانە کردوون ،کەوا دەڵێت .... (ئەگەر مسوڵمانان کۆبوونەوە ، هەر یەکێک لە سەر سوپاکەی خۆی ئەمیرە...... ئەمیری هەموو سوپاکەش نەعمانی کوڕی موقەڕین دەبێت ..... ئەگەر نەعمان شەهیدبوو ، حوذەیفە ئالاکە هەڵدەگرێ .... ئەگەر ئەویش شەهید بوو ،جەریری کوڕی عبد الله )....
بەم جۆرە ، ئەمیری بڕواداران سەر لەشکر هەڵدەبژێری هەتا حەفت کەس دیاری دەکات ... هەردوو سوپاکە پێک گەیشتن ... فارسەکان لە سەدوپەنجا هەزار کەس

.. مسوڵمانەکان لە سی هەزار کەس ، زیاتر نا....

کوشتار دەستی پێ کرد جەنگێک بوو وێنەی نەبوو ، کەوا بە گەورەترین جەنگ لە مێژوو دادەنرێت لە ترسناکیدا .... سەر لەشکری مسوڵمانان شەهید بوو... واتە نەعمانی کوڕی موقەڕین ...وەپێش ئەوەی ئالای مسوڵمانان تێکەڵی خۆڵ ببێ و نۆزاوی ببێ ، سەر لەشکری نوێ بەدەستی ڕاست وەریگرتەوەو ، بای سەرکەوتن ئالاکەی شەکاندەوە بەخێرایی ونازایەتی وتێکوشانێکی مەزن ، ئەم پێشەوایە نارەمانەش حوذەیفەی کوڕی یەمان بوو .... ئالاکەی بە خێرایی هەڵگرت وەسیەتەکەی نەعمانیشی هێنا جێ کەوا دەنگوباسی شەهیدبوونی نەعمانی شاردنەوە تاکو جەنگەکە کۆتایی دێت ، بانگی (نەعیمی کوڕی موقەڕین)ی کرد لەشوێنی (نەعمان)ی برای دانا بۆ ڕێز لێنانی .....

ئەم شتانە لە چەند ساتێک هاتە دی شەڕ بەردەوام بوو بەزیرەکی و وریایی حوذەیفە ،پاشان هەروەک شێرێکی بریندار ڕووی کردە ڕیزەکانی فارس و هاواری کردە سەریان وگووتی :

(الله اکبر ، صدق وعده !! الله اکبر ، نصر جنده!!)

پاشان پەتی ولاغەکەی توندکرد لە ناوەڕاستی سوپاکەی هاواری کرد :

ئەی شوێن کەوتووانی موحەممەد ،ئەوە بەهەشتەکانی خوایە ئامادەن بۆ پێشوازیتان،زیاتر چاوەڕوان مەکەن ....

ئامادەبن.....ئەی پیاوانی بەدر ...

پێشکەون ، ئەی قارەمانانی خەندەق و ئوحدو تەبوک....

بەم جۆرە حوذەیفە بەهەموو خوێن گەرمی یەکی جەنگ وحەز پێ کردنی ، ورەی هەر لە بەرزی دابوو تاکو جەنگ کۆتایی هات بەشکستیەکی گەورەی فارسەکان ... شکستێک وێنەی نەبوو !!!

بەڵێ حوذەیفە قارەمان بوو هەست ونەست وحیکمەتی ، کاتێک لە مزگەوت گیری خواردبوو ... هەروەها قارەمانیش بوو لە بەخشینی گیانی ،کاتێک وەستا لە گۆڕەپانی جەنگ ....بەڵکو قارەمان بوو لە هەر کارێک پێیان پسپاردبایەو ، وەراوێژێک داوای بکردایە .... ئەوکاتەی (سەعدی کوڕی ابی وقاص)ومسوڵمان گواستیانەوە لە مەدائین بۆ کوفەو ،لێی جێنشین بوون..

ئەمەش پاش ئەوەی ئاووهەوای مەدائین ئازارێکی زۆری عەرەبە مسوڵمانەکانی دا ، تا وای لێهات عومەری کوڕی خەتاب بۆسەعدی نووسی کەوا یەکسەر ئەم شوێنە بەجێ بهێڵن پاش دۆزینەوەی شوێنێکی شیاوتر ، بگوازنەوە بۆ ئەم شوێنە ...... لەم کاتەدا ،کێ ئەم کارەی پێ سپێردرا بۆ هەڵبژاردنی ئەم شوێنە ..... ؟

حوذەیفەی کوڕی یەمان و سەلمانی کوڕی زیاد ڕۆیشتن ، شوێنێکی شیاویان بۆ مسوڵمانان دۆزیەوە........

کاتێک گەیشتنە خاکی کوفە ،خاکێکی ڕووت ولماوی بوو ، بەلاّم حوذەیفە بۆنی ئاووهەوایەکی خۆشی کرد ، بەهاوڕێیەکەی خۆی گووت :
ئەم جێگایە ئەگەر خوا حەزبکات . . .
بەم جورە نەخشەی کوفە کێشراو دەستی ئاوەدان کردنەوە کردی بەشارێکی ئاوەدان. . . لەوکاتەوە مسوڵمانان گواستیانەوە بۆ ئەوێو ، هەتا لە نەخۆشەکانیان چاک بوونەوەو ، بێ هێزەکان بەهێزبوونەوەو شادەمارەکانیان گەشایەوە . . .
حوذەیفە پیاوێکی هەست ونەست فرەوان و زیرەک بوو ، زۆر بەهرەمەند بوو ، هەموو کاتێک دەیگووتە مسولمانان :
(باشترینتان ئەو کەسە نیە واز لە دونیاو ڕۆژی دوایی دەهێنێت . . . وە ئەوکەسەش نا واز لەڕۆژی دوایی دەهێنێ بۆ دونیا ، بەڵکو ئەو کەسە باشترینیانە هەر دوولای هەبێت)
ڕۆژێک لە ڕۆژانی سالی سی وشەشی کۆچی . . . . داواکرا بۆ گەیشتن بەخوای گەورە. . . کاتێک خۆی ئامادە کردبوو بۆ گەیشتن بەدوا کاروان هەندێک لە هاوەڵەکانی هاتنەلای و ، ئەویش پرسیاری لی کردن :
کفنەکەتان لەگەڵ خۆتان هێناوە. . . . . ؟؟؟
گووتیان : بەڵێ . . .
ئەویش گووتی : پێم نیشان دەن. . . .
کاتێک بینی ،بینی نوێ وچاکن. .
کۆتا ووشە لە سەر لێوە بەخەندەکانی ، پێی گووتن :
(ئەم کفنە چی یە بۆتان هێناوم؟! . . . دوو پارچە قوماش بەشم دەکات ئەم کراسە زیادە . . . من لە ناو قەبر هیچ شتێک بەجێ ناهێڵم تەنها شتێکی کەم نەبێت ،هەتا بیگۆڕیەوە بەشتێکی چاکتر لە ئەو . . . یان خراپ تر لە ئەو . .
بەم ووشانەش کۆتایی هێنا ، هەتا ئەوانەی دانیشتبوون گوێ یان لی بوو گووتی:
(مرحبا بالموت .....حبيب جاء على شوق ،لا افلح من ندم ) ، واتە : (مردن بەخێربێت ، خۆشەویستەو بە پەرۆشەوە هات ، سەرناکەوێت ئەو کەسەی لی ی پەشیمان دەبێت) .
ئیتر گیانی پاکی بەرز بۆوە بۆ لای خوای پاک وبێ گەرد ،هەزاران سلاّو لە گیانی پاکی بێت.

٢٢

# عثمانی کوڕی مظعون

خوا پەرستێک بوو ، وازی
لە خۆشی دونیا هێنابوو

﴿ ٢٢ ﴾

# عثمانی کوڕی مظعون

## خوا پەرستێك بوو ، وازی لە خۆشی دونیا هێنابوو

ئەگەر دەتەوێت ناوی یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆمار بکەیت بە گوێرەی کاتی هاتنیان بۆ ناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام ، ئەمە بزانە کاتێک گەیشتیتە ژمارەی چواردەهەمین خاوەنەکەی (**عثمانی کوڕی مەظعون**) ە ....

ئەمەش بزانە ، ئەم یاوەرە واتە **کوڕی مەظعون** ، یەکەم یاوەربوو لە کۆچکردووەکان لە شاری مەدینە کۆچی دوایی کرد ... یەکەم مسوڵمان بوو لە (بەقیع) نێژرا ....

لە کۆتایشدا ئەمە بزانە ، ئەم یاوەرە بەرێزەی ئێستا ژیاننامەی دەخوێنینەوە یەکێکە لە خواپەرستە مەزنەکان .. ئەو خوا پەرستەی کەوا ڕۆژی قیامەتی بە پێش ژیانی دونیا خستبوو نەک وەکو ڕاهیبەکانی کەنیسەو دێرەکان ....

بەڵێ ... **عثمان** وازی لە دونیا هێنا بە هەموو خۆشی و گەورەیی و پلەو پایەکانیەوە .... خواپەرستنەکەشی کارێکی بەردەوام بوو لە ڕێگای هەق و ، وازهێنانێکی تێکۆشەرانە بوو لە ڕێگەی چاکەو چاکە خوازی دا ....

کاتێک ئیسلام لەدڵ و دەروونی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ تیشکی بەرەونەقی بلاوەی کردو دەبریسکایەوە .. ووشە بە جۆش و خرۆشەکانی ـ دروودی خوای لەسەر بێت بەنهێنی و ترسەوە بە هەندێک گوێچکە دەکەوت و دەنگی دەدایەوە .

(**عثمانی کوڕی مەظعون**) یەکێک بوو لەم ژمارە کەمانەی کە بە خێرایی بەرەو پیری بانگی خوا چوو ولەدەورەی پێغەمبەرەکەی کۆبۆوە ....

هەر وەکو بڕواداره ئازارمگرو کۆڵنەدەرەکان ، **عثمانیش** بەشی هەبوو لەم ئازارو ئەشکەنجەی کەوا بەهۆی هاوبەش پەیدا کەرەکانەوە بێوە بابەتی سەردەم :

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ژمارە کەمە بڕوادارە چەوساوە مەزنەی هەڵبژارد ، فەرمانی پێ کردن بە کۆچ کردن بۆ حەبەشە ، بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێت لەم ئازارو ئەشکەنجانەی بەرەنگاریان دەبۆوە بەدەستی دوژمنەکانیان ، (**عثمانی کوڕی مەظعون**) ئەمیری پۆلی یەکەم بوو لە کۆچکردووەکان ، هەروەها (سائب) ی کوڕیشی هاوڕێیەتی دەکرد وڕوویان کردە ولاتێک دوور لە ئازارو ئەشکەنجەو چاولی سورکردنەوە هەروەک پیشەی کۆچکردووەکان بۆ حەبەشە لە هەردوو کۆچەکان ـ یەکەمینیان و دووەمینیان (**عثمانی کوڕی مەظعون**) یش خوا لیی ڕازی بێت هیچ شتێکی زیاد نەکرد تەنها پابەند بوون و دەست گرتنی بە ئیسلام نەبێت .... ئەوەی ڕاستی بێت ئەم دوو کۆچەی ئەو یاوەرانە بۆ حەبەشە ، نموونەیەکی دیارو بێ وێنەی زیندوو بوون لە مێژووی ئیسلام دا ...

ئەوانەی بڕوایان هێنا بوو بە پێغەمبەر ﷺ وبەڕاستیان دەزانی و ، بە دوای ئەم

ڕووناکی‌یە کەوتبوون کەوا بۆی هاتبووە خوارەوە ، بە تەواوی لە بت پەرستەکان بێزار ببون لەگەڵ ئەم هەموو تاریکی و نەزانیەی تەنگی پێ هەڵچنیبوون ، لە کاتێکدا ئەوان سرووشتێکی پاک و ڕاست و بێ غەوشیان هەڵگرتبوو ، کەوا ڕازی نەبوون بە پەرستنی بتێکی داتاشراو لەبەرد یان قوڕێکی سوور کراوە ......!!

لەم کاتەی کۆچیشیان کرد بۆ حەبەشە ئەم جارەیان بەرەنگاری ئایینێک بوونەوە کە ئەویش ئایینی مەسیحی بووو دێرو پیاوی ئایینی خۆی هەبوو سەرپەرشتی ئەکرد ...

هەرچەندە ئەم یاوەرە بەرێزانە بە هەواو هەووسی خۆیان دوورکەوتنەوە لە بتپەرستی و بەلام لێرەدا دیسان پیاوانی دێرو کەنیسەکان هەموو تواناو چالاکی‌یەکی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ ئەوەی دلی ئەم کۆچکردووانە ڕابکێشن بۆ سەر ئایینەکەی خۆیان و دانیان پێ بهێنن بە مەسیحیەت کە ئایینێکی شیاوو گونجاوە ...

لەگەڵ ئەم هەموو هەوڵ دان و داواکاری‌یەی ئەوانیش ئەم کۆچکردووانە چۆن بەرگە دەگرن لەسەر ئایینەکەی خۆیان و گوێ ڕایەلیەکی بێ ئەندازەیان دەبێت بۆ ئیسلام و پێغەمبەرەکەیان ﷺ ....؟!! بەجۆش و خرۆشەوە چاوەڕێی ئەم ڕۆژە نزیکەیان دەکرد کەوا تێیدا دەگەڕێنەوە بۆ ولاتە خۆشەویستەکەیان ، بۆ ئەوەی خوای تەنها بپەرستن و ، جێگایەک بگرن لە دواوەی پێغەمبەری مەزن ... لە ڕۆژانی ئاشتی ناو مزگەوت و ... لە ڕۆژانی گۆڕەپانی جیهادا ، کاتێک هاوبەش پەیدا کەران ناچاریان دەکەن هێزی بازوویان لەگەلدا بەکار بهێنن .

بەم جۆرە کۆچکردووەکان لە ولاتی حەبەشە بە سەلامەتی و دلنیایی ژیان ، (عثمانی کوڕی مە ظعون)یش لەگەلیاندا ژیا ، بەلام بە هیچ جۆرێک لەو دوورە ولاتەدا پیلانەکانی ئامۆزاکەی (ئومەیەی کوڕی خەلەفی) لە یاد نەدەچوو بەو ئازارو ئەشکەنجەی کردی بەم وبە موسلمانان ،

لە کاتێکدا یاوەرە کۆچکردووەکان لە ولاتی حەبەشە خواپەرستی یان دەکردو ، ئەم بەشەی لە قورئان هاتبووە خوارەوە کاریان پێ دەکرد لەگەل ئەوەش دل و دەروونیان هەلدەچوو بۆ شارە خۆشەویستەکەیان ، لەم کاتەدا لە کاروانەکان هەوالیان پێ گەیشت کەوا سەرجەم قورەیشەکان موسلمان بووینەو ، لەگەل پێغەمبەری خوادا کرنووش دەبەن بۆ خودای تاک و تەنیای بێ وێنە .....

لێرەدا کۆچکردووەکان بارو بارگەیان تێک ناو سۆزی دوورە ولاتی بالی پێ هەلگرتن بۆ شاری مەکە .... وا دیار بوو هێشتان بە تەواوی لە دەروازەکانی شار نزیک نەبوونەوە بۆیان دەرکەوت کە ئەو هەوالەی پێیان گەیشت بوو دەربارەی موسلمان بوونی قورەیش ڕاست نیەو بەلکو درۆیە ...

بەلام تازە کاتیان لە دەست چوو ، تێگەیشتن کەوا لەم کارە پەلەیان کردووەو ..ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان ئەوەش مەکەیە بە بینایی چاو دیارە .... مەککە گوێی لی بوو بە هاتنی نێچیرەکانیان ماوەک بوو لەبەر دەستیان ڕزگاریان ببوو

تەڵەیان دانابۆوە بۆ ئەوەی بکەونە ناویانەوە .... بەڵام ئێستاکە دەرفەتیان بۆ دروست بووەو نابێت کەمتەرخەمی لێ بکەن....

بەڵام پەنا هێنان لەم ڕۆژگارە خووێک بوو لە خوەکانی عەرەب و جێگای ڕێزی خۆی هەبوو ، ئەگەر پیاوێکی بێ دەسەڵات و بێ هێز پەنای هێنا با بۆ گەورەیەکی قورەیشی ئەوا دەکەوتە ژێر پارێزگاریەک خوێنی نەدڕێژراو ، هیچ پشێوی و ترسێک ڕووی تێنەدەکرد ...

ئەوانەی گەڕانەوە نەیانتوانی پەنا ببەن بۆ کەسێک .... لەبەر ئەوە ئەوانەی گەیشتن بە پەنا ژمارەیان کەم بوو ، یەکێک لەم کەسانی گەیشتن بە پەنا (**عثمانی کوڕی مە ظعون**) بوو کەوا چووە ژێر پەنای (**وەلیدی کوڕی موغەیرە**)

بەم جۆرە بە سەلامەتی و دڵنیاییەوە چوە ناو شاری مەککەو ، کوچەو کۆڵانەکانی دەبڕی و کۆڕو کۆبوونەوەکانی دەبینی ، کەس نەیدەتوانی دەست درێژی بۆ بکاو ستەمی لی بکات بەڵام (**کوڕی مە ظعون**) ... ئەو پیاوەی قورئان دڵ و دەروونی پتەوکردبوو و ، موحەممەد ﷺ پەروەردەی کردبووو ، ئاوڕی لە دەوروبەری خۆی دایەوە ، برا مسوڵمانە هەژارو چەوساوەکانی خۆی بینی ، ئەوانەی نەیانتوانی پەناو پشت وەدەست بهێنن ، دەیبینی ئازارو ئەشکەنجە لە هەموو لایەک ڕوویان تێدەکات ، ستەم لە هەموو ڕێگایەک دەیان گرێتەوە ، هەرچی ئەوە لە دەروونی خۆی دڵنیایەوە ، دوورە لە ئازارو ئەشکەنجەی میللەتەکەی ، گیانی ئازادی گەرم بووو ، ویژدانی پاکی جۆشی دا ، لەسەر دەروونی خۆیدا زاڵ بوو ، لەماڵەوە دەرچوو بە نیازی نەخشە کێشان بۆ چارەسەرکردن و لادانی ئەو پەنایی کەسێبەری لێکردبوو لە لایەن (**وەلیدی کوڕی موغەیرەی**) بێ باوەڕەوە ، کە قەدەغەی کردبوو بۆ بەرگە گرتنی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیەی کە تووشی دەبوو لە پێناوی خوادا بۆ ئەوەی ببێتە خاوەن شەرەف وەکو برا مسوڵمانەکانی و ، ببێت بە پێشەنگی دونیای باوەڕدراو ، موژدە بدا بەم جیهانەی کە بۆ بەیانی ئیمان و بڕوایی و یەکتا پەرستی تێیدا دەتەقێتەوە ...

با ئێستاکەش گوێ بدەینە ئەو کەسانەی کە بە چاوی خۆیان ئەم دیمەنەیان بینیووە :

[ کاتێک (**عثمانی کوڕی مە ظعون**) بینی یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئازارو ئەشکەنجانەی دێتە ڕێ یان و ئەویش دێت و دەچێت لە ژێر سێبەری وەلیدی کوڕی موغەیرە ، **عثمان** گووتی :۔ سوێند بەخوا هات و چوونی من لە ژێر سێبەرە پەنای هاوبەش پەیدا کەرانە ، هاوڕێ و برا مسوڵمانەکانم تووشی ئازارو ئەشکەنجە دەبن ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە من ناگرێتەوە ، ئەمەش نەنگێکی گەورەیە لە دەروون و ئیمانم دا.

چووە لای وەلید کوڕی موغەیرەو ، پێی گووت :۔

- ئەی باوکی عبد شمس پەیمانەکەت جێ بەجێ کرد ، پەنایەکەم بۆت گێڕایەوە.

ئەویش پێی گووت :

- بۆچی ، ئەی کوڕە برام .. لەوانەیە یەکێک لەنەتەوەکەم ئازاری دابێت .. ؟ ؟

ـ ئەمیش گووتی :ـ نەخێر ، بەڵکو بە پەناو سێبەری خوا ڕازیم ، نامەوێت بێجگە لەم پەنا بۆیەکێکی تر ببەم .. بچین بۆ کەعبە پەنایەکەم بە ئاشکرا لی وەرگرەوە ، هەروەک چۆن بە ئاشکرا پەنات دام ....
دەرچوون تاکو گەیشتنە کەعبە ، وەلید گووتی : ئەمە (عثمان)ە ... هاتووە بۆ لام پەنای بۆ گەڕاندوومەوە ....
(عثمان) گووتی : ڕاست دەکات .. من پەنایەکی بەڕێزم لی‌ی بینی و ، بەلام حەزم کرد بێجگە لە خوا پەنا بۆ کەسی تر نەبەم...
پاشان عثمان ڕۆیشت ، (لەبیدی کوڕی ڕەبیعە) لە کۆڕێک لە کۆڕەکانی قوڕەیش هەڵبەستی دەخوێندەوە ، (عثمان) لە گەڵیان دانیشت ، لەبید گووتی :ـ ألا كل شيء ماخلا الله باطل ، (عثمان)گووتی : ڕاستت گووت ، لەبید گووتی : وكل نعيم لامحالة زائل ، (عثمان) گووتی :ـ درۆت کرد ... خۆشی بەهەشت نەبڕاوەیەو تەواو نابێت (لەبید) گووتی:
ئەی کۆمەڵی قوڕەیش ، سوێند بە خوا کەس نەبووە کۆڕ دانیشتنتان لی تێک بدات ، کەی ئەمە لەناوتان ڕووی داوە ...!!؟؟ ، پیاوێک لە کۆمەڵەکە گووتی :ـ ئەمە پیاوێکی کەمەو وازی لە ئایینی ئێمە هێناوە ، دڵت هیچ نەکات بە قسەی ئەو ...
(عثمان) وەلامی دایەوەو تاکو نێوانیان توند بووو ، ئەم پیاوە بۆی هەڵساوە مستێکی لەناو چاوی‌دا ، وەلیدی کوڕی موغەیرەش لی‌ی نزیک بوو ، بینی چی بە (عثمان)کرا ، گووتی :ـ سوێند بەخوا ئەی کوڕە برام ، ئەم چاوە ساغەی تۆ وای بەسەر هات لەژێر چاودێریەکی پتەو بوو .....
(عثمان) پی‌ی گووت :ـ سوێند بەخوا ئەم چاوە ساغەی ماوە زۆر هەژارە بەرامبەر ئەم چاوەی لە پێناوی خوا تووشی ئازار بوو ، من لەژێر پەنای یەکێکم لە تۆ پایەدار ترو بە تواناترە ئەی باوکی عبد شمس ...!!
(وەلید پی‌ی گووت :ـ وەرە ئەی کوڕە برام ، ئەگەر حەز دەکەیت بگەڕێوە ژێر پەنام (کوڕی مەظعون) گووتی : نەخێر .......) ، (عثمانی کوڕی مەظعون) لەم دیمانە گەڕایەوە وچاوی ئازاری دەچێشت ، بەلام دەروونی پاکی مزگێنی و خۆشی و ئیمان پتەوی تێدا هەڵدەقولا
بەم جۆرە (عثمانی کوڕی مەظعون) بوو بە نموونەیەک ، هەر شایانی ئەم بوو ، بەم جۆرەش جیهان بە چاوی خۆی کەڵەپیاوێکی وای هێناکایەوە ئەم جۆرە هەڵوێستە بێ وێنەیەی نواند ...
ئیتر (عثمانی کوڕی مەظعون)ئەم پەنایەی وەلیدی گەڕاندەوە کەوتەوە بەر ئازارو ئەشکەنجەی قوڕەیشەکان ، بەم کارەش زۆر بەختیار بووو ، دڵی خۆش بوو ، هەرچەندە ئازار تینی بۆ دەهێنا ، وەکو زێڕ چۆن ئاگر تینی بۆ بهێنێت بەم جۆرە بە بریقەو زەردتر دەبوو ..

بەم جۆرە لەگەڵ برا مسوڵمانەکانی ڕۆژگاری بەڕێ کرد ، توونديي و ئازارو ئەشکەنجە پەشیمانی نەدەکردەوەو ..... لێدان و کوتان نەیتوانی وازی لێ بهێنێ لە ئایینەکەی ...!!

(عثمان) کۆچی کرد بۆ مەدینە ، لە کاتێکدا ئیتر نە (أبو جهل) و نە (أبو لهب) و ، نە (أمیه) ونە (عتبه) نەیانتوانی ڕێگای ئایینەکەی پێ بگرن وا هیچ دڕندەو پیاو خراپێک نەبووە کۆسپ لە ڕێگایاندا ، شەویان پێ تاڵ بکاو ڕۆژیان پێ خوێناوی بکات.

(عثمان) لەگەڵ ئەم هەموو یاوەرە بەڕێزانە کۆچی کرد بۆ مەدینە کەوا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بە هۆی ئەم خۆڕاگری و ئارامەیان کە تووشیان بوو ، لەم تاقیکردنەوانەی کە پێییان کرا لە زەحمەت و ناخۆشی ترس ، ئەمانە کۆچیان نەکرد بۆ مەدینە بۆ ئەوەی لێی پاڵ دەنەوەو تەمبەڵی بیان گرێت ، بەڵکو دەرچوون لە هەموو دەرگایەکی فرەوان بۆ هەموو لایەکی ڕووی زەوی کەوا هەڵگری بیروڕای یەکتا پەرستی خوا بوون ، ئیسلام و قورئانیان بە مزگێنی برد بۆ ئادەمیزاد .

لە خانووی کۆچی مەدینەدا ، گەوهەرەکانی (عثمانی کوڕی مە ظعون) بریتی بوون لە زوهدو خوا پەرستی و گەڕانەوە بۆ لای خوا ..... لەگەڵ ئەمەشدا خواپەرستێکی زیرەکی وابوو خواپەرستی یەکەی وای لێ نەکرد خۆی لە خەڵک جوێ بکاتەوە .... بەڵکو ژیانی تۆمار کرد بە کردەوەی چاک و جیهادی ڕێگای خوا ...

بەڵێ ..... خوا پەرستی شەوو ، سوارچاکی ڕۆژ ، بەڵکو خوا پەرستی شەوو ڕۆژو سوار چاکی شەو ڕۆژ ..

هەموو یاوەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەم ماوەیەی ژیانیاندا ، گیانێکی زوهد و تەوبەیان وەرگرت ، هەرچی (عثمانی کوڕی مە ظعون) بوو ، ڕێڕەوێکی تایبەتی وەرگرت ، ئەوە بوو لە کاتی زوهد و خوا پەرسی یەکانی شێوەیەکی بۆ ندارو سەیرو سەمەرەی دروست کرد ، شەوو ڕۆژەکانی هەر هەمووی بە نوێژو یادی خوا ڕووناک دەکردەوە .....!!

بەهۆی چوونی بۆ ناو دەریای خوا پەرستی بە تەواوی تامی ئیمانی چەشت تاکو وای لێ هات واز بهێنێت لە هەموو ئەم خۆشیانەی ژیان کەوا خەڵک خۆی پێوە خەریک دەکرد ....!! وای لێ هات تەنها جل و بەرگی دڕا لەبەر بکات و ، تەنها خواردنی ووشک بخوات ..

ڕۆژێک چووە ناو مزگەوت ، پێغەمبەرو یاوەرەکانی دانیشتبوون ، ئەویش جل و بەرگێکی دڕاو پینەداری لەبەر کردبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ دڵی بۆی سووتاو ، یاوەرەکانیشی فرمێسکیان لە چاو هاتە خوارەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

[ من وا دەبینم ڕۆژێک دێت بە جل و بەرگێک دێن ، بە جل و بەرگێک دەڕۆن ، سفرەیەکی خواردنتان لەبەر دەم دادەنرێت و ، یەکێکی ترتان لەبەردەم هەڵدەگیرێ ..

دیواری ماڵەکانتان بڵند دەکرێ هەروەک دیواری کەعبە ... ؟!]
یاوەرەکان گووتیان :-
[ خۆزگە ئەم ڕۆژە بۆ ئێمە بایە ئەی پێغەمبەری خوا ، تووشی ئەم خۆشیانەی ژیان بووینایە] .. پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دانەوەو فەرمووی :-
[ ئەم ڕۆژە دێت .. ئیمڕۆ باشترە بۆ ئێوە لەم ڕۆژگارە ] ...
ئەمەش شتێکی سانابوو ، کوڕی مەظعون گوێی لەم گفت و گۆیە بوو ، ئەوەبوو زیاتر پێشوازی کرد لە نەبوونی و ڕای کرد لە خۆشیەکانی دونیا ...!!
تاکو وای لی هات کۆتایی هێناو وازی هێنا لە چوونە لای خێزانەکەی ، هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەمەی زانی بانگی کردو پی‌ی فەرموو :-
[ إن لاهلك عليك حقاً ] .. واتە خێزانەکەت مافی لەسەر تۆ هەیە ..
پێغەمبەری خوا ﷺ یەبیێ ئەندازە خۆشی دەویست .....
ئەو کاتەی گیانی پاکی بەرێ کەوت بۆ کۆچی دوایی بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم کۆچکردوو کۆچی دوایی بکات لە شاری مەدینە ، یەکەم کەس بێت بەرێ بکەوێت بۆ بەهەشت ، لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە خزمەتی بوو ... ئەوەبوو چەماوە بۆی و نێوچەوانی ماچ کرد ، بە فرمێسکەکانی لەشی بۆندارکردو وەکو بارانی بەهار چاوەبەزەیی‌یەکانی فرمێسکی لی هاتە خوارەوە تاکو ڕووی پاکی (عثمان)ی تەڕکرد پێغەمبەری خوا ﷺ بەم ووشانە ماڵ ئاوایی لە یاوەرە خۆشەویستەکەی کرد :-
[ڕەحمەتی خوات لی بێت باوکی سائب ... دونیات بەجێهێشت ، هیچت لی‌ی وەرنەگرت و ، ئەویش هیچی لێت وەرنەگرت] .
پێغەمبەری بەزەیی و بەوەفا لە پاش مردنیشی ئەم یاوەرەی لە یاد نەدەکرد ، هەموو کات لە یادی بوو ، ڕەحمەتی بۆ دەنارد ..ئەوەتە لەکاتی کۆچی دوایی (روقیەی کچی دەفەرمووێت لە کاتێکدا گیانی پاکی دەرچوو ، فەرمووی :
[ إلحقي بسلفنا الخير ، عثمان بن مظعون ] ....!!
واتە :-بگە بە پیاو چاکی ڕۆیشتوومان ، (عثمانی کوڕی مەظعون)....
ئنجا برای مسولمان و موجاهید پێویستە لە سەرت ئەم وانە گرنگە لە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ وەربگری تاکو لە توانات دابێت هیچ هاوبەش پەیدا کەرێک و بێ باوەڕێک نەکەیت بە پەنای خۆت ، بۆ ئەوەی لەم خێرو چاکەیەی پێت دەگات لەلای خوای گەورە بێ بەش نەبیت و پشت بەستان و پێویستیت تەنها بەخوا بێت بە هیچ کەسێکی تر نەبێت ....
خوای گەورە لە یاوەری بەڕێز (عثمانی کوڕی مەظعون)و هەموو ئەم یاوەرە بەڕێزانە ڕازی بێت کەوا ئارامیان گرت لەسەر هەموو ئەم ئازارو ئەشکەنجانەی تووشیان بوو لە ڕێگەی بیروباوەڕو ئاینە پیرۆزەکەیان ....

٢٣

# ئوسامەی کوڕی زەید

خۆشەویستی کوڕی
خۆشەویست

«٢٣»

# ئوسامەی کوڕی زەید

## خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست

ئێمە ئێستا لەم کاتەدا لە ساڵی حەوتی پێش کۆچیداین لە شاری مەکە... پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارو ئەشکەنجەی قـ ـیشیەکان دەچێژێ لە گەڵ یاوەرەکانی ... بە هوێ بانگەێشتنی ئاینەکەی تووشی ر ــ ـەیەک خەم وبەلای زۆر گەورە بووە.

لە گەڵ ئەم هەموو خەم و ناخۆشیەش ز ـ ـنی رووناک بۆوە بە کەیف خۆشیەکی پرشنگدار ... یەکێک لە مزگێنی دەرەکانی هاتەلای و مزگێنی ئەوەی دایی کەوا (ام ایمن) منداڵێکی بووە.... پێغەمبەری خوا ﷺ دەم وچاوی گەش بۆوە بە کەیف خۆشی یەک ،دڵ ودەروونی پێی رووناک بۆوە .. دەبێ ئەم منداڵە کێ بێت ئەم هە موو کەیف خۆشی یە بهاوێتە دلی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەم منداڵە چاوگەشە ، رۆڵەی خوشەویستی پێغەمبەری خوایە ﷺ ، ئەم منداڵە (ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثەیە)....

رۆژێک گەورەی بڕواداران (عومەری کوڕی خەتاب) خوا لێی رازی بێت دانیشتبوو ماڵی (بيت المال)ی مسولمانانی دابەش دەکرد ، کاتێک نەوبەی عبدالله کوڕی عمر هات ئـ ـمی عمر بەشی خۆی دایێ ... ، پاشان نەوبەی ـوسامەی کوڕی زەید هات ،ئیمامی عمر دوو بەشی عبداللەی وەگرت ...

ئەگەر عمر بەشی خەڵکەکە بدات بە گوێرەی گەورەیی ، ئەو بەلایانانەی هاتوونەتە سەریان لەسەر ئیسلام ، (عبدالله کوڕی عمر) ترسا لەوەی لە ئیسلام دا کۆتا جێگای هەبێت ، لە کاتێکدا لەم ئومێدە دابوو بە خواپەرستی و جیهادو پشت لە دونیاکردن و ،لە خوا ترسانەکەی لە مسو لمانە سەرەتاکان بێت لەلای خوا ...

لێرەدا پرسیاری لە باوکی کرد وگووتی :.(تۆ ئوسامەت گەورەتر کرد لە سەرەمن و لە کاتێکدا من لە هەموو دیمانەک دا. لە گە ڵ پێغەمبەر بـووم ئەوان نەیانبینیووە...) ئیمامی عومەر وەلامی دایەوەو فەرمووی :

(ئوسامە لەلای پێغەمبەری خوا خۆشەویستر بووە لە تۆ... باوکیشی لە لای پێغەمبەری خوا خۆشەویست تر بووە لە باوکت ...) لە نێوان یاوەرەکانیش نازناوی : (خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست) بوو..

باوکی (زەیدی کوڕی حاریثە) خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا پێغەمبەری خوای هەڵبژارد لەسەر باوک ومام ودایکی وکەس وکاری ، کاتێک وەستا لەگەڵ پێغەمبەری خوا لە نێو کۆمەڵە باوەرێک و فەرمووی :

ـەرە دەکەم بە شاهێد ئەوە کوڕمەو ، میراتم لی دەگرێ و میراتی لی دەگرم )بەلام پاشان یاسای بەکوڕکردن بە ئایەتێک لە ئایەتەکانی خوا ئەم نەریتە سڕایەوە باوکی گەڕاوە سەر ناوی جارانی زەیدی کوڕی حاریثە ....

دایکی نازناوی (ام ايمن) بوو ، ناویشی (بركة الحبشية) بوو ... (ام ايمن) بەندەی

ئامینەی کچی وەهەب بوو دایکی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانیدا پێغەمبەری خوای پەروەردە کرد ، پاشی مردنی دایکیشی گرتیە باوەشی خۆی ،کاتێک چاوی بە دونیاکردەوە ، کەسی نەناسی ، تەنها (ام ایمن) نە بێت. بەقوڵایی دڵی ئەم ئافرەتەی خۆش دەویست ، زۆر جار دەیگوت :

ئەمەدایکمە پاش دایکم ،بۆماوەی کەس وکارمە .....

مسولمانان بە گشتی کەیف خۆش بوون بە لە دایک بوونی (اسامە) بێجگە لەویش بەهیچ مندالیک ئاوەها کەیف خۆش نەبوونیە ،لەبەر ئەوەی هەر شتێک پێغەمبەری خوای کەیف خۆش بکرد بایە ئەوانیشی کەیف خۆش دەکرد ..

مسولمانان زیادە ڕەویان نە کردووە لەم نازناوەی کەوا لە ئوسامەیان نابوو ، چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەوەندەی خۆشویستووە بە خۆشە ویستیەک دونیای پڕکردبوو ... ئوسامە لە تەمەنی دا یەک تەمەن بوونە لەگەڵ (حسن)ی کوڕی فاتمە زەهراء ، ... (حسن) دەم وچاو سپی وزۆر جوان بوو شێوەی زۆر لە باپیرەی پێغەمبەری خوا دەچوو.. بەلام ئوسامە منداڵێکی پێست ئەسمەر بووکە شێوەی زۆر لە دایکە حەبەشیەکەی دەچوو...

بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ لە خۆشەویستی دا جیاوازی نەدەکرد لە نێوانیان ، ئوسامەی دەهێنا لە سەرڕانی دادەناو ،حەسەنیشی لە سەر ڕا نە کەی تری دادەنا ،

پاشان کوشینی بە سینگی خۆیەوە وفەرمووی: (اللهم اني احبهما، فاحبهما)..وانە (پەروەردگارا من خۆشم دەوین ،تۆش خۆشت بوێن ) ...

خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ ئوسامە گەیشتبووە ڕادەیەک ڕۆژێک ئوسامە ساتمە دەکات لە بەر دەرگا ،نێوچەوانی دەشکێت ، خوێنی لی دێت ، پێغەمبەر ﷺ ئامارە بۆ عایشە دەکات خوا لی ی ڕازی بێت ، خوێنەکەی بسرێتەوە ، بەلام عائیشە توانای نابێت ...

پێغەمبەر ﷺ خۆی هەڵدەستێت جێگای برینەکەی دەمژێت و ، خوێنەکەی بۆدەسرێتەوە وقسەی خۆشی بۆ دەکات بە ووشەی بەزەیی وخۆشەویستی.

پێغەمبەر ﷺ هەروەک ئەوەی لە منداڵی ئوسامەی خۆش ویستووە ، هە روە ها بە گەنجیش خۆش ویستوو.....

حکیم کوڕی حەزام یەکێک لە ناودارە کانی قورەیش دیاریەکی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بریتی بوو لە خەناوکەیەکی بە نرخ کە کڕیبووی لە یەمەن بە پەنجا دنیاری زێڕ ،ئەم خەناوکەیە خەناوکەی یەکێک لە پادشایەکانیان بوو بە ناوی (íÐá یزن ) ...

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دیاریەی وەرنەگرت ،لە بەر ئەوەی ئەم کاتە هاوبەش پەیدا کەربوو ، لی ی وەرگرت بە پارە .... پێغەمبەری خوا ﷺ یەک جار لە ڕۆژی هەینی لە بەرە خۆی کرد ،پاشان لە بەری کردەوەو لەبەر ئوسامەی کوڕی زەیدی کرد ، پی ی لە نێوان هاوڕێیە یاریدەدەرو کۆچکردووەکان دەهاتوودەچوو...

کاتێک ئوسامە تەمەنی گەیشتە تەمەنی بلوغ ،هەموو سیفەتێکی چاک وگەورەی لی ی دروست بوو جێگای ئەوەبوو ببێتە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ : ئوسامە تاکو بلی ی زیرەک و ، ئازایەتی بی وێنەو ،دا نایەک بوو هەموو شتێکی لە جێگای خۆی

دادەناو پاک دوور لەشتی بۆگەن و ،ڕووخۆش هەموو کەس خۆشی دەویست ،خوا پەرست و لە خوا ترس خوا خۆشی دەویست ...

لە ڕۆژی ئوحد لە گەڵ کۆمەڵێک لە منداڵە کانی یاوەران دەیانویست جیهاد بکەن لە ڕێگای خودا ، پێغەمبەر ئەوەی ڕێگای پێداڵەگەڵە خۆی بردی ، ئەوی گێڕایەوەش ،گیڕایەوە لە بەر بچووکی تەمەنیان ،یەکێک لەم منداڵانەی گێڕایەوە ئوسامەی کوڕی زەید بوو ،کاتێک گەڕاوە ،هەردوو چاوە بچووکانی فرمێسکی لی دەهاتە خوارەوە لە خەمی ئەوەی جیهادی نەکرد لە ژێر ئالای پێغەمبەری خوا ﷺ .

لە جەنگی خەندەق ،دووبارە ئوسامەی کوڕی زەید هات وچەند کەسێک لە گەنجە یاوەرەکانی لەگەڵ بوو ، ئەمجارەیان بەژن وبالای بلندتر ببوّوەو بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای پێ بدات ، پێغەمبەری خوا دلی نەرم بوو بۆی وڕێگای پی دا شمشێرەکەی هەلگرت بۆجیهاد لە ڕێگای خوا ، ئەو کاتە تەمەنی پانزە سالان بوو ...لە ڕۆژی حونەین کاتێک مسولمان شکستیان خوارد ،ئوسامەی کوڕی زەید وعەباسی مامی پێغەمبەروابی سفیان کوڕی حاریث کوڕەمامی وچەند یاوەرێک لە یاوەرە بە ڕێزکانی چەسپان لە شوێنی خۆیان ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەم چەند نەفەرە توانی سەر کەوتنی جەنگە کە بگێڕێتەوەو ، مسولمانە هەلاتووەکان بپارێزی و پێش ئەوی گاورەکان بە دوایان بکەون ..

لە جەنگی (مؤتة) ئوسامە جیهادی کرد لە ژێرئالای باوکی زەیدی کوڕی حاریثە ئەو کاتە تەمەنی هەژدە سالان بوو ،بە چاوی خۆی شەهید بوونی باوکی بینی و ، نەبی هێز بووولەرز گرتی ، بەلکو هەرماوە و شەڕی کرد لە ژێر ئالای جەعفەری کوڕی ابی تالیب تاکو بەچاوی خۆی شەهید بوونی ئەویشی بینی ، پاشان لەژێر ئالای عبداللە کوڕی ڕەواحەش جیهادی کرد تاکو ئەویش شەهید بوو ، پاشان لەژێر ئالای خالیدی کوڕی وەلید تاکو ئەم سوپا بچووکە ڕزگاری بوو لە ژێر جنجرۆکی ڕۆمەکان ...پاشان ئوسامە گەڕاوە مەدینە باوکی گەیشتە لای خواو ،لاشەی بی گیانی لە لێوا ڕ ڕۆخەکانی شام بە جێهێشت و ، سواری ولاخەکەی باوکی بوو کە لە سەری شەهیدببوو .

لە سالی یانزەی کۆچی ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە ئامادە کردنی سوپایەک بۆ هێرش بردنە سەر ڕۆم ، تێیدا ابو بکر و عمر و سعد کوڕی أبی وقاص (أبا عوبیدەی جەراح و زۆری تر لە ئەصحابە بە تەمەنەکان بەشداریان کرد ، ئوسامەی کوڕی زەیدی لەسەر کردن بە ئەمیر ...ئەوکاتە تەمەنی لە بیست سالی تێپەڕ نەبووبوو ، فەرمانی پی کرد ولاغی لە لیواری (بلقاء) و (قەلای داروم) بێخیت ، نزیک (غزە)ی ولاتی ڕۆم .

کاتێک سوپا ئامادە دەبوو ، پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش کەوت ، کاتێک نەخۆشیەکە زۆری بۆ هێنا ، سوپا لە ڕۆیشتن وەستا چاوەڕێی کرد ، بۆ ئەنجامی باری تەندروستی پێغەمبەری خوا ﷺ ..

ئوسامە گووتی :

[ کاتێک نەخۆشی زۆری هێنا بۆ پێغەمبەری خوا ، چوومە لای و خەلکەکەش لەگەلم هاتن ، چوومە لای بینیم قسە نەکاو بی دەنگ بووە لەبەر گرانی نەخۆشی یەکە ، دەستی

بلّند کرد بۆ ئاسمان و پاشان دەستی لەسەرمن دانا ،زانیم دوعا بۆ من دەکات].
پاش ئەوەی کەمێک ماوە پێغەمبەری خوا کۆچی دوایی کرد ﷺ ، بەیعەت درا بە ئەبوبەکر. فەرمانی بە دەرچوونی ئوسامە کرد . .
بەڵام چینێک لە یاریدەدەرەکان وایان تێ ڕوانی دەرچوونەکە دوا بکەوێت ، داوایان لە عمری کوری خەتاب کرد دەربارەی ئەمە قسە بکات لەگەڵ ابوبکر ، پێیان گووت : ئەگەر ڕازی نەبوو هەر بڕۆن ، پێی ڕابگەیەنە ئەمیراتیەکە بداتە دەست پیاوێک بە تەمەنتر بێت لە ئوسامە . . .
کاتێک ئەبوبکری ڕاستگۆ گوێی لە پەیامەکەی یاریدەدەرەکان بوو لە عومەر وای لێ هات شالاوی برد بۆ عومەر بە دانیشتنەوە بەهەردوو دەستان ریشی عومەری گرت و بە تووڕەیی پێی گووت :-
[ دایکت بۆت لە سینگی خۆی بدات ولێی وون بێت ئەی کوڕی خەتاب . . پێغەمبەری خوا ﷺ کردیتی بە ئەمیرو فەرمانم پێ دەکەیت لایببەم ؟! سوێند بەخوا ئەمە نابێت . .
کاتێک عومەر گەڕاوە لای خەلک ، پرسیاریان لێ کرد چی کردووە ، فەرمووی : دایکتان لە سینگی بدات بۆتان ، ئەوەی تووش هاتم من تووشی هاتم لە پێناوی ئێوە لەلای خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ .
کاتێک لەشکر بەسەرۆکایەی سەرۆکی گەنج دەرچوو ، خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیادە بوو وئوسامە بەسوار ، ئوسامە گووتی : ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا : سوێند بەخوا سوار دەبی یان دێمە خوارەوە . . ئەبوبەکر گووتی : سوێند بەخوا نەدێیتە خوارەوەو ، سوێند بەخوا نەسواریش دەبم . . . چی تیایە ئەگەر کاتژمێرێک لە پێناوی خوا پێم تۆزاوی بێت ؟! پاشان گووتیە ئوسامە : ئاینی و ڕاسپاردە و کۆتا کردەوەکانت بەخوا دەسپێیرم ، وەسیەتت دەکەم بە ڕاپەڕاندنی ئەوەی پێغەمبەری خوا فەرمانی پێداون ، پاشان لێی نزیک بووەوە وگووتی :ئەگەر تێبڕوانی یارمەتیم بدەیت بە عومەر ، ڕێگای بدەی لە گەڵ من بمێنێتەوە ، ئوسامە ڕێگای عومەری دا بەمانەوە. . . .
ئوسامەی کوڕی زەید لە گەڵ لەشکر ماوەو ، هەموو ئەم فەرمانانەی پێغەمبەری خوای بەجێ گەیاندو ، ولاخەکانی مسولمانان لەسەر ڕۆخەکانی (البلقاء) خستیان و (قەلای داروم) لە خاکی فەلەستین و . . . . ترسی ڕۆمەکان لە دلی مسولمانەکان هەلقەناو ، ڕێگای پێشیانی خۆش کرد بۆ ڕزگار کردنی ناوچەکانی شام و میسرو ، باکوری ئەفەریقاو هەمووی تاکو دەریاکان . .
پاشان ئوسامە بەسواری ولاخەکەی باوکی شەهیدی گەڕاوەو ، لەگەڵ خۆی غەنیمەیەکی ئەوەندە زۆری هێناوە ، مسولمانان ئەوەندە مەزەندەیان لێ نەدەکرد ، تاکو گووتیان :- [نەمان بینی سوپایەک وەک سوپای ئوسامەی کوڕی زەید ،بێ زیانترو بە غەنیمە تر ] . .
ئوسامە خوا لێی ڕازی بێت خاوەنی هەموو ڕەوشتێکی مەزن بوو وای کردبوو جێی خۆی بکاتەوە لەناو دڵی پێغەمبەرو ، لە پێش چاوی گەورە بێت . . کوڕی دوو مسولمانی بەرێزی مسولمانە سەرەتاکان بوون ، کاتێک لە پێشەوە هاتن بۆ ناو ئیسلام

، لە هەموو کەس زیاتر گوێ ڕایەڵ بوون بۆ پێغەمبەرو لێی نزیک بوونەوە . . ڕۆڵەی ئەو مسولمانە پاکانە بوون ، کەوا لە یەکەم قوومی شیریان لەفیترەتێکی پاک بوون ، بەبێ ئەوەی تۆزی نەزانی تاریکیان پێ بکەوێت . . .

خوا لێی ڕازی بێت هەر لەمنداڵییەوە ، مسوڵمانێکی بەهێزو ، بڕوادارێکی ناسک نەبوو ، بەڵکو بەرگەی هەموو ناخۆشییەکی ئیمانی وئایینی دەگرت ، لە گوێڕایەڵییەک لە شوێنی خۆی و ، ورەیەکی بێ ئەندازە . ئوسامە تاک بوو لە زیرەکی و ، بێ وێنە بوو لە بێ فیزی و ، تووڕە بوونیشی لە پێناوی خواو پێغەمبەر سنووری نەبوو . . .

هەروەک دەبینین ئەم گەنجە ڕەشە لووت ئەفنەسە جێگای خۆی کردۆتەوە لە دڵی پێغەمبەرو لە ڕیزی مسوڵمانانیش جێگایەکی بەرزی هەیە ، لەبەر ئەوەی ئایینی خوا پێوانەی گەورەیی ئادەمیزادی چاک کردووە ، بە ووشەی : [ ان أكرمكم عندالله اتقاكم].

پاشان بینیمان کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ فەتحی مەککە دەکات لەڕاست و چەپی ئوسامەو بیلالە . . دوو پیاوی پێست ڕەشی لە نزیکە ، بەڵام ئەم ووشە خواییەی لە هەردوو دڵە پاکەکەیان هەڵیان گرتووبوو ، هەموو شەرەف و گەورەیی یەکی پێ بە خشیبوون ، ڕۆژێک ئوسامە وانەیەکی زۆر بەنرخی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت ، پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ بە دووساڵ ، پێغەمبەر بە ئەمیری سریەیەک دەینێرێت بۆ سەر هەندێک گاوران.

ئەمە بۆ یەکەم جار بوو بکرێت بە ئەمیر . .ئەوەبوو لەم کارەیەدا سەرکەوتنی هێنا هەواڵی سەرکەوتنی گەیشت بە پێغەمبەری خواو زۆر پێی کەیف خۆش بوو . . .

باگوێمان لە ئوسامە بێت هەواڵی ئەم سەرکەوتنەمان بۆ باس بکات :

[. . . . چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، مزگێنی دەرەکە هەواڵی سەرکەوتنەکەی پێ ڕاگەیاندبوو ، دەم و چاوی زۆر بە کەیف بوو ، لەلای خۆی دایناو و پاشان گووتی : بۆم باس بکە . . . ((منیش بۆم باس کرد و ، ئەوەم بۆباس کرد کاتێک کۆمەڵەکە شکان ، گەیشتمە پیاوێکیان ڕمێکم بۆ ڕاگرت ، گووتی : لااله الا الله لێم داو کوشتم . . .

دەم و چاوی پێغەمبەری خوا ﷺ تێکچوو فەرمووی :

وەی لەتۆ ئەی ئوسامە . . . !

چۆن ئەوەت کرد بە (لااله الا الله) . . ؟

وەی لەتۆ ئەی ئوسامە

چۆن ئەوەت کردبە (لااله الا الله) . . ؟

[ئەوەندەی لەسەرم گووتەوە تاکو وام زانی لەهەموو ئەم کارانەی کردوومە بێ بەش بوومە ] . . [ سوێند بەخوا ، شەڕ لەگەڵ یەکێک ...م بڵێت (لااله الا الله) پاش ئەوەی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ] . .

بەڵێ ئەم وانەیە وانەیەکی مەزن بوو کەوا ئاراستەی ژیانی ئوسامەی خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست کرا لە لایەن پێغەمبەری خوا لەم ڕۆژەی ئەم ووشانەی لە پێغەمبەر

گوێ لی بووو تاکو کۆچی دوایی کرد .. ئەگەر ئەم پیاوە لەم کاتەدا ، پێغەمبەری خوا قەدەغەی کوشتنی بکات تەنها ئەوەندەی گوتووە :لااله الا الله .. ئایا چۆن ڕێگا دەدات مسولمانی تەواو ، بڕواداری تەواو بکوژرێت ...

کاتێک فیتنەی گەورە ڕووی دا لە نێوان ئیمامی عەلی و یارمەتیدەرەکان لە لایەک و ، معاویەو یاریدەدەرەکانی لەلایەکی تر ، ئوسامە هەڵوێستی بێ لایەنی وەرگرت ..

ئوسامە ئیمامی عەلی زۆر زۆر خۆشدەویست ، هەروەها هەقیشی لەئەو دەبینی ...بەلام چۆن دەبێت موسلمانێک بکوژێت بڕوای بە خواو بە پێغەمبەر هەبێت ، پێغەمبەری خوا گازاندەی ئەوەندەی لی کرد گاورێکی کوشتووە لەکاتی ترس و هەلاتن گووتیەتی :لااله الا الله .. ؟!! لێرەدا نامەیەکی بۆ ئیمام عەلی ڕەوانە کردو گووتی :
(تۆ ئەگەر لە دەمی شێر بیت .. حەز دەکەم لە گەلت بم بۆناو دەمی بەلام ئەمە کارێکە بۆم ناڕەوانرێت ....!!)
بە درێژایی ئەم ناکۆکی یەو جەنگانە خۆی دوور خست ...
هەندێک لە هاوڕێکانی هاتن بۆ لای گفتو گۆیان لەگەڵ کرد دەربارەی ئەم هەڵوێستەی ئەویش پی ی گووتن :
[ شەر لەگەڵ یەکێک ناکەم بلێت لااله الا الله ] ..
یەکێک پی ی گووت : ئەی خوا نافەرموێت :[ وقاتلوهم حتى لاتكون فتنه ويكون الدين كله لله ) ... ئوسامە وەلامی دانەوەو گووتی :.[ ئەوانە هاوبەش پەیدا کەر بوون ، شەرمان لەگەڵ کردن تاکو فتنە ڕوونەدەدات و ئایین هەمووی بۆ خوا بێت ] .
ئیمامی عومەر ئەگەر بگەیشتبایە بە ئوسامە پی ی دەگووت : مرحبا بأميرى ..
ئەگەر یەکێک بیبنیایە سەری سووڕ دەما لی ی ، ئەویش دەیفەرموو : پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری کردوومە بە ئەمیر ..
لە سالی پەنجاو وچواری کۆچی ... ئوسامە بە پەرۆش بوو بگات بە خوای پەروەردگار دەیەوێت بگەڕێتەوە نیشتمانی یەکەمی .. دەرگاکانی بەهەشت کرانەوە ، بۆ ئەوەی پێشوازی لە یەکێک لە موجاهیدە پیاو چاکە لەخوا ترسەکان بکات ...
ڕەحمەتی خوا لەم دەروونە پاکە گەورەیە بێت .. تاکو ئێستا مێژوو پیاوی مەزن و ئازاو موجاهیدو پاک و ڕەوشت بەرزی بە چاوی خۆی نەبینیوە وەک ئوسامە ....




# خەواتی کوڕی جوبەیر

موجاهیدێك ئیمانەکەی
پاراستی

# ﴿ ٢٤ ﴾

# خەواتی کوڕی جوبەیر

## موجاهیدێك ئیمانەکەی پاراستی

خۆ بەکوشتدان بەڕاستی نابێ و قووڵ نابێ تەنها ئەگەر بیروباوەڕێکی خوایی نەبێت ڕێگای نیشان نەدات و ، ئیمانەکەی نەیهێنێ و نەیبات ، چونکە ئەگەر ئازایەتیەک خاڵی بێت لە بیروباوەڕی ئیمان ، ئەوا دەبێتە جۆرێک لە جۆرەکانی پاڵ پێوەنانی کوێرانە کەواتە نەجێگیر دەبێ و نەبەردەوام دەبێت . . . . .

ئەگەر پیاوێکی تێکۆشەر پێویستی بە هێزی بازووو هێزی دەروون هەبێت ، جێگای گومان نیە هێزی گیان زیاترەو بەهێزترەو گەورەترە ، لە هێزی لەش و مادده . .

ئەگەر دڵی موجاهیدیش پڕبوو لە ئیمان و بڕوایی ، ئەوا لەسەر ڕێگای ڕاست بەردەوام دەبێ و سەرکەوتووش دەبێت ، هەروەک ئەم مێرخاسە بەهێزو بەوەفایانەی کەوا ڕاستیان کرد لەگەڵ ئەو پەیمانەی دابوویان بەخوا ، ئی وایان هەبوو خوا بۆ خۆی بردیەوە ، ئی واشیان هەبوو وا چاوەڕێ دەکاو ، هەر لەسەر ئەم ڕێگا ڕاست و درووستە بەردەوامە

ئایینی ئیسلام شتی سەیرو سەمەرەی لە دڵ و دەروونی نەوەکانی دروست کرد ، پاش ئەوەی لە زەلکاوی کوفرو هاوبەش پەیدا کردن ڕزگاری کردن و ، ڕێزی لێنان بەو نیعمەتەی ڕێگای ڕاستی پێ نیشان دان و ، یارمەتی دان بەم ڕۆناکی یەی کەوا تاریکایی یەکانی پێ ڕووناک کردەوە ، کاروباری دونیاو قیامەتی بۆ چاک کردن ، کاریان وەک ئەوەیە خوای گەورە دەربارەیان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت :-

[ الله ولي الذين آمنوا يخرجهم من الظلمات الى النور ، والذين كفروا أولياءهم الطاغوت يخرجهم من النور إلى الظلمات ، أولئك أصحاب النار هم فيها خالدون]

زۆر لە خەڵکان کاتی خۆی شەیتان پێیانەوە خەریک بووفێڵی لێ کردوون و ڕێگای پێ بزرکردوون ، کاتێک ئیسلام هات ڕزگاری کردوون و پیاوی سەیرو سەمەرەی لێ دروست کردوون و ، بوون بە نموونەی مرۆڤایەتی ئازادو بەرێز لەم ژیانەدا ، خوای ئێمەش بە ئارەزووی خۆی مرۆڤ دروست دەکاو هەڵیدەبژێرێت . . .

یەکێک لەمانە :-یاوەری بەرێزی موجاهید باوکی عبدالله خەواتی کوڕی جوبەیر کوڕی نەعمان کوڕی ئومەیەی ئەنصاری ، هەروەکو ئەوانەی تر کەوتبووە ناو گێژاوی جاهیلیەت لە ئارەزوو ڕابواردن ، کاتێک تیشکی ئیسلام هەڵات لەم بارەوە گۆڕا بۆ بارێکی تر ، مسوڵمان بوو ، بە مسوڵمان بوونەکی چاک وساغ . .

وا ڕیوایەت دەکەن پێغەمبەری خوا ﷺ پاش مسوڵمان بوونی (خوات) گاڵتەی لەگەڵ دەکرد ، ئاماژەی بۆ کردەوەکانی پێشووی دەکرد ، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەم ڕێگای

گرتوویتی و بەردەوام بێت لەسەری ، پێغەمبەر بەزەردەخەنەوە پێی گووت : وون بووەکەت چۆنە ؟ ئەویش وەلامی دایەوەو گووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ، خوا چاکەی زۆری پێ بەخشیم و خۆم دەپارێزم بەو خودایەی منی لە خراپەکاری گەڕاندەوە بۆ چاکەکاری .....

واریوایەتیش دەکەن پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە :ووشترەکەت چی لی هات ؟ ئایا لێت بزربوو ؟ ئەویش وەلامی دایەوە :ـ لەم ڕۆژەی مسولمان بوومەو ، لەم کاتەی پابەند بوومە بەئیسلام ...نەخێر .

ئەم گفتوگۆیە ئاماژە دەکات بۆ ڕووداوێک ڕوی دا لەسەر خەوات کاتی جاهیلی ، وا ڕیوایەت دەکەن کەوا بەلای چەند ئافرەتێک تێدەپەڕێ سەری سوور دەمێنی لە جوانییان ، لەلایەن دادەنیشێ و ، داوایا لی دەکات گوریسێکی بۆ بهۆننەوە بۆ حوشترەکەی ، پاساوێکی دۆزیەوە کەوا حوشترەکەی بەرەلا بووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای دا تێدەپەڕێ و ، دەبینێ خەوات گفتوگۆ لەگەل ئافرەتان دەکات ، پێغەمبەر ڕووی خۆی لە خەوات و ئافرەتەکان وەرگێڕا ، کاتێک بووە مسولمان پێغەمبەر ﷺ بەزەردەخەنەوە پرسیاری ئەم ووشترەی لێکرد ، خەوات بەم قسەیە وەلامی دایەوە :ـ
ئیسلام بەستایەوە ئەی پێغەمبەری خوا .

هەر چەند کات بەسەر دەچوو مسولمانیەتی خەوات پتەوترو چاکتر دەبوو ، بەردەوام دەبوو لەسەر ئەم ڕێگایە ، خەوات یەکێک بوو لە سوارچاکەکانی پێغەمبەر ﷺ کەوا لە خزمەتی دەوەستاو ، فەرمانەکانی جێ بەجێ دەکرد و هەموو هێزو توانایەکی بۆ گوێ ڕایەلی ئەو تەرخان دەکرد ، گیانی خۆیان دەهاوێشتە مەواقیفی قوربانی و خۆ بەکوشت دان بۆ ڕەزامەندی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی ﷺ ، بەهاندەری ئیمانێکی بەهێزو پتەو ، کەوا زال ببوو بەسەر دەروونیان ، وای لێکردبیوون لە ژیانیان بەردەوام بن بەسەربازی خواو ، چاکترین پاداشیش لەلای خوایە بۆ پیاوچاکان ...

لە جەنگی بەدر خەوات هەموو توانایەکی خۆی ئامادەکرد ، کەوا پەیمانی دابوو بەخوا لەسەر جیهاد تاکو شەهید بوون ، هەروەها عبدالرحمن کوڕی جوبەیری براشی لەگەل بوو

بەلام خەوات چی بکات ؟ـ ویستی خوا وابوو ، ویستی خواش گەڕانەوەی بۆنیە ، خەوات تلیشێک شاخی تیژی لە پێی ڕابچێ و ، پێی بریندار ببێ و خوێنێکی زۆری لی بێت و ، پێی هەو بکات و نەخۆش بکەوێت وتا ئێستاش جەنگ دەستی پێنەکردووە

لە پەڕتووکی (تهذيب الأسماء) ی نەوەوی دەلێت : خەوات تووشی نەخۆشی یان برینداری بوو ، نەیتوانی بەردەوام بێت لە جەنگ و گەڕایەوە ، دەلێت :ـ پێی شکاوە ، لە پەڕتووکی (نهایه) دەلێت : خەوات پێی بە بەردێکی تیژی گەورە دەکەوێت .

پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا بەگەڕانەوەی خەوات لەبەر نەخۆشی ، خەوات بەدل تەنگی

و خەمگینیەوە گەڕایەوە لە جێگایەک پێی دەڵێن ( العفرا ٠)    هەروەها (ە
کوڕی صمە)ش لە جێگایەک گەڕایەوە پێی دەڵێن ( الروحا ٠ ) لەبەر ئەوەی سەو ...
تووشی شکستی شکان هاتبوو .....

پێغەمبەر ﷺ چاوی ئەو کەسانەی دەبینی کەوا سوور بوون لەسەر جیهادکردن لەبەر پاساوێکی شەرعی دەگەڕانەوە لەجیهاد ، جیاوازی پێ نەدەکرد ، لەگەڵ ئەوانەی بەشداری جیهادیان دەکرد ، لەبەرئەوە بەشی غەنیمەی جیهادی دابە خەواتی کوڕی جوبەیر ....

جەنگی ئوحدیش هاتە پێشەوە ، پاڵەوانی موجاهید خەواتی کوڕی جوبەیر بۆی چوە پێشەوە ، عبداللەی کوڕی جوبەیری براکەشی لە گەڵدا بوو ، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ کردی بە ئەمیری تیر هاوێژەکان لەسەر چیایەکە ، ئەویش ئاگاداری ئەوانەی کردەوە کەوا فەرمانی پێغەمبەری خودا دەشکێنن بە بەجێهێشتنی جێگاکانیان ...

خەوات لەم جەنگەدا تووشی بەلای گەورە هات ، تێکۆشا بەتێکۆشانێکی مەزن ، گوێی نەدەدا بەوەی دەکەوێتە سەر مردن یان مردن دەکەوێتە سەر ئەو ، پاشان خەوات بەردەوام بوو لە هەڵوێستە خۆبەکوشتدان و قارەمانیەتیەکانی ، تاکو ناوی دایەوە ، ناو دەنگی کەوتە نێو تێکۆشەرەکان ، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە هەندێک شوێندا بەکاری دەهێنا لە لیستی پێشەنگە بلیمەتەکان کەوا هەڵدەستا بەکۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی دوژمنان ، هەروەک لەگەڵ ئەم سێ کەسەی ڕەوانەی کرد بۆ سەر جوڵەکەکانی (بنـي قريظـة ) . نەفرەتی خوایان لێ بێت . بۆ دڵنیا بوون لە هەڵوێست و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانیان...

خەوات هەروەک موجاهید یێک لەم گۆڕەپانە مایەوە ، بە وەفا بوو بۆ ئەم پەیمانانەی لەگەڵ خوای خۆی دایبوو ، هەروەها ئەو خودایە گەورەشی لە یاد نەدەچوو ، کەوا ڕێگای ئیسلامی پێ نیشان دابوو ، سوپاسی دەکرد لەبەر ئەوەی دڵی پڕ کردبوو لە ئیمان ، هەروەها ڕێزی لەوە دەنا بەو جیاوازی‌یە گەورەیەی کاتی جاهیلی وتا ئێستاش یەکێکە لە شوێن کەوتووەکانی محمد ﷺ لەبەر ئەوە هەموو کات ئەم ئایەتەی خوای گەورەی لە یاد نەدەچوو کەوا فێری بەندەکانی خۆی کردبوو ، هەروەک دەفەرموێت :-
[ ربنا لاتزغ قلوبنا بعد إذ هديتنا ، وهب لنا من لدنك رحمة ، إنك أنت الوهاب ، ربنا أنك جامع الناس ليوم لاريب فيه ، ان الله لايخلف الميعاد ] ..

هەروەک ئەوەی خەوات هەموو توانایەکی خۆی بەکارهێنا لە گۆڕەپانی جەنگ و تێکۆشان ، بەڵکو ئەم قارەمانیەتی و تێکۆشانانەی ڕازاندەوەو جوان کرد بەشارەزایی لە ئایینەکەی ، پابەندی بەفەرمودەی پێغەمبەرەکەی کەوا دەفەرموێت : (من يرد الله به خيرا" يفقه في الدين) واتە :- ئەگەر خوا بیەوێت چاکە لەگەڵ بەندەیەکی خۆی بکات ، شارەزای دەکات لە ئایینەکەی ...

لەبەر ئەوە خەوات چەند فەرمودەیەکی لە پێغەمبەر ڕیوایەت کردووەو ، لەبەر

نیکمەتێک خوای گەورە هەر خۆی دەزانێت خەوات ڕیوایەتی فەرموودەی (صلاة خوف) ی کرد ، ئەویش نوێژی جیهادە ، یاخود نوێژی جەنگ هەروەک قورئان لە سورەتی نساء باسی دەکا هەروەک خوای گەورە دەربارەی ئەم مەسەلەیە دەفەرموێت :ـ
ود الذين كفروا لو تغفلون عن أسلحتكم وأمتعكم فيميلون عليكم ميلة واحدة] .. لەم ڕوشە خودایی‌یە پڕ بەماناو موعجیزانە ، خوای گەورە وانەیەکی گرنگ و بەنرخ دەدا بە موسڵمانە بڕوادارەکان لە بەئاگایی و هۆشیاری و چاوبڕینە دوژمن ، تاکو ماوە نەدرێ بە دوژمنان لە ناکاو هێرش و پەلامار بهێنن بۆ سەر بڕواداران ، لەبەر ئەوەی جەنگ خۆی فرت و فێڵە هەروەک گەورەی ئادەمیزاد محمد ﷺ دەفەرموێت . . .
ئای بۆ ئەم میللەتە موجاهیدە بڕوادارەی پابەندی ئەم دروشمە نەمرەی خوای گەورەی دانا دەبن :-[ ود الذين كفروا لو تغفلون عن أسلحتكم وأمتكم فيميلون عليكم ميلة واحدة] .. بۆ ئەوەی هەموو کاتێک و هەتا هەتایێ ئاگادارو ئامادە باشی بن بەرامبەر دوژمنەکانیان و ، لە سەنگەرێکی مەحکەم بن ، لە بەر ئەوەی خوای گەورە دڵنیایان دەکات بە فەرمانی ئاگایی و هوشیاری بەرامبەر دوژمن ، هەروەک دەفەرموێت :ـ[يا أيها الذين آمنوا خذوا حذركم] .. واتە :ـ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ئاگاداری خۆتان وەرگرن .
لەگەڵ ئەوەی کە زانیمان دەربارەی قارەمانیەتی و مەزنایەتی خەوات ، خەوات لەگەڵ ئەمەشدا هۆنراوەی دەخوێندەوە دەتگووت گۆرانی بەسۆزو خرۆش دەڵێت ، هەروەک مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە عومەری کوڕی خەتاب خوا لیی ڕازی بێت لەگەڵ کاروانێک دەبێت خەواتی کوڕی جوبەیریان لەگەڵ دەبێت ، خەڵکەکە بە خەوات دەڵێن:ـ هەندێک لە هۆنراوەکانی (ضرار) مان بۆ بخوێنەوە ..
ئیمامی عومەر دەڵێت :ـ وازبهێنن لە باوکی عبدالله بابەدڵی خۆی هۆنراوەمان بۆ بخوێنێتەوە . . . خەوات تاکو بەیانی هۆنراوەیان بۆ دەخوێنێتەوە ، ئیمامی عومەر دەڵێت ، بابەس بێت ئەی باوکی عبدالله ، بەیانیمان بەسەردا هات . . .
ڕۆژان وسالان بەسەر خەوات دا تێپەڕی ، ئەرکەکانی خۆی بە گوێرەی توانا ڕادەپەڕاندن ، چاوەکانی لە دەست داو ، پاشان لە سالی چلی کۆچی گەیشت بەپێغەمبەرەکەی و هاوڕێکانی (خوا لیی ڕازی بێت) کۆچی دوایی بەجێ هێنا
خوای گەورە ڕازی بێت لەو موجاهیدەی کەوا ئیسلام پارێزگاری لیکرد : خەواتی کوڕی جوبەیر . . . . .

٢٥

# قەتادەی کوڕی نەعمان

ئەم ڕێزلێنانەی پێغەمبەری
خوا ﷺ، بۆقەتادە چ ڕێزلێنانێک
بوو؟!

﴿٢٥﴾

## قەتادەی کوڕی نەعمان

### ئەم ڕێزلێنانەی پێغەمبەری خواﷺ، بۆقەتادە چ ڕێز لێنانێك بوو؟!

باسای هەق و یەکسانی وئیمان ، ڕێزی موجاهیدان و پاداشتی چاکەکاران بە خۆوە دەگرێ ،بۆ ئەوی هەرگیز کردەوەی چاکە ویستان لەیاد نەچێ و ،بەد فەڕو چاکەکار یەکسان نەبن ،قورئانی گەورەش دەفەرمووێت: (هلْ جزاء الاحسان الا الاحسان)...

داهێنەری کردەوەی چاك هەردەم بەختەوەرە لە نێو پیاوە هەڵبژاردراوەکانیدا ، هەرچەندە تەمەنی درێژ بێ وکات بەسەر بچێت... لێرەدا جوانترین و باشترین بەرنامە ، بەرنامەی خوایە بۆ ئەوەی گیانی خۆتی بۆ لەسەر دەست دابنێیت، بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی پێشوازی لی بکەیت و ، ئنجا بەرێی بکەویت بۆ بەرەکانی خۆبەقوربانی دان و بەرخودان، لەپێناوی بیروباوەڕ یان سنوورەکانی خوا یان هەق..

لێرەدا ڕێز لێنانی موجاهیدان بە ماڵ وبەووتە کارێکی پیرۆزە لە ڕوانگەی ئیسلام ئەم ڕێزلێنانەش لە سەر خودی خۆیان کەم نابێتەوەو ،کۆتایی هاتنی ژیانیان ، بەڵکو درێژدەبێتەوەو درێژ دەبێتەوە بۆمنداڵ ونەوەکانیان ..... خوای گەورە لە ڕێنمایی ئاینەکەیدا دیاری کردووە بۆ بەندەکانی ، کەوا خوای گەورە مرۆڤی بڕوادار منداڵ و نەوەکانی دەپارێزێت ،لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی داوە بەچاودێریەکی ڕوون وئاشکرا بەڕێز لێنانی موجاهیدان و چاکە لەگەڵ کردنیان ، هەروەها ڕێنماییەکانی ئاراستە کردوون بۆ ڕێزلێنانی منداڵ ونەوەکانیشیان و ، پێویستی پارستنیان لە شکستی هەژاری و نەبوونی وفەوتان ، هەروەها لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ خەلیفەو یاوەرو شوێن کەوتووەکانیشی پابەندی ئامۆژگاری و ڕێنمانی یە پرشنگدار و بەهێزەکانی بوون ...

دەتوانین نموونەیەک پێشکەش بکەین لە مێژووی ئیسلامی زێرین ، پێمان بسەلمێنی میللەتی هۆشیار و ڕەسەن پارێزگاری لە پیاوە چاك و (صالحە) کانی خۆی دەکات ،کردەوەی چاکیان لە یاد ناکاو ، هەر دەرفەتێکی بۆ ڕەخسا باسی ئەمری و پیاوەتی وئازایەتی و چاکەکانی دەکات ، بۆئەم مەبەستەش دەست درێژ دەکەین بۆ باسکردنی سیرەی یاوەری پاڵەوانی موجاهیدی تێکۆشەر :ـ باوکی عەمر ،قەتادەی کوڕی نەعمانی (ظفر )ی ئەنصاری ،کە لە دایکەوە برای ( ابو سەعیدی خودری یە ) :

قارەمانی تێکوشەر قەتادەی کوڕی نەعمان یەکێکە لە ئەنصاری یە پێشەنگەکانی ئیسلام ،بەیعەی عەقەبەی بینیووە ، یەکێکە لەسەرەتا بڕوادارە موجاهیدەکان ، زۆر بە لێرانی ر ئازایانە جەنگی کردووە لە جەنگەکانی بەدرو ئوحدو خەندەق وهەموو دیمانەکان لە گەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەدرێژایی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ جیهادی ڕێگای خوای [illegible] پێغەمبەری خوا کۆچی دوایی کرد قەتادە دانەبڕا لە جیهادکردن ،

!

هەروەک پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر خوا ﷺ لە ناو ئەو سوپایە بیرا ئەوا (ئوسامە ا
سەر کردایەتی دەکرد بە وەسیەتی پێغەمبەرو ، ئە بوبەکری ڕاستگۆش بەڕێی ئەد
(خوای گەورە لە هەمووان ڕازی بێت).

ڕووداوێک بەسەر قەتادە داهات لە جەنگی ئوحد ئامۆژگاری و پەندە بۆ موجاهیدان ، یەکێک بوو لەم چەند موجاهیدە کەمەی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ مابەوە ،بەرگری لەئیسلام و پێغەمبەری خوا کرد لەم کاتە تەنگەدا ، بەرامبەر ئەم تیرانەی بە گەورەی ئادەمیزاد محمد ﷺ دەهات ،تیرێک بە دەم وچاوی قەتادە کەوت و ، چاوی لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێناو ، بە دەمارێک کەوتە سەر ڕوومەتی ، بەلاّم لەگەلّ ئەمەشدا کۆڵی نەدا لە تێکوشان.

کاتێک جەنگ وەستا هەندێک لە یاوەرەکان وایان پێ چاک بوو قەتادە چاوەکەی دەربهێنێ وفرێی بدات ، بەلاّم قەتادە چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ چاویشی هەر لەسەر ڕوومەتی بوو ، پێغەمبەر بەنەرمی چاوەکەی بە پەنجە پیرۆزەکانی گرت و ،بەدەستی پیرۆزی بە سۆزو بە بەزەییەوە لە شوێنی خوێ داناوەو پاشان دوعای لە پەروەردگاری کردو فەمووی : [اللهم ق عين قتادة كما وقى وجه نبيك بوجهه ، فاجعلها احسن عينيه ، واحدهما نظرا ،اللهم اكسه جمالا] ... واتە: پەروەردگارا چاوی قەتادە بپارێزە ،هەروەک دەم وچاوی پێغەمبەرەکەتی پاراست بەدەم وچاوی خۆی ، بیکە بەچاکترین چاوو ،تیژی بکەیت و ، پەروەردگارا جوانیشی پێ بدەی ..... خوای گەورە دوعای پێغەمبەرەگەی گیراکردو ، لەگەلّ تکای خۆشەویستەکەی و هەلّبژاردەکەی ، چاوی قەتادە چاک بۆوەو تەندروستی چاک بوو ، بە لکو لەپاشان وای لێ هات ببێتە جوانتر وتیژترین چاوی و ، تەندروستی لە چاوەکەی تری باشتر بوو ، وای لێ هات نەیدەزانی و هەستی پێ نەدەکرد کام چاوی لێدراوە ، ئەگەر چاوێکی کول بوایە چاوە ڕژاوەکەی کول نەدەبوو ، ئەم ووتانەش هەمووی قسەی مێژوو و گێڕانەوەی سیرەیە ، نە خەیالّی ئێمەیەو نەوتاری ئێمەیە !!

(امام البوصيرى) لە هەمزیەتەکانی باسی دەستی پیرۆزی پێغەمبەر دەکاو دەلّی :

واعادت على قتادة عينا فهى حتى مماته النجلاء

چاوی (نجلاء) واتە چاوی گەش وساغ ......

قەتادە (خوالّی ڕازی بێت) بە ڕاشکاوی وبەڕاستگۆیی بۆمان دەگێڕێتەوەو ، دەلّێت : لە ڕۆژی ئوحد دەم و چاوی پێغەمبەری خوام دەپاراست بە دەم وچاوی خۆم لە تیری گاوران ، لە کۆتاییدا تیرێک بە ناو چاوم کەوت و ، گرتمەوە... گووتم ئەی پێغەمبەری خوا ،من ژنێکم هەیە خۆشم دەوێت دەترسێم ببینێ ڕکی لێم ببێتەوەو دوور کەوێتەوە....

پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم :ئەگەر حەز دەکەیت ئارام بگریت بە هەشت بۆ تۆ دەبێت ، ئەگەر حەز دەکەیت بۆت بگێڕمەوەو لەلایەن خودا دوعات بۆ بکەم ، گووتم : ئەی

پێغ ـبەری خوا ، بە هەشت پاداشتێکی گەورەیەو ، بە خششێکی مەزنە ، بەڵام چاوکەم بـر ـکـێرەوەو ، داوای بەهەشـتم بۆبکـە ..... چاوەکـەی بـۆ گەڕاندمـەوەو ،دوعـای بەهەشتیشی بۆ کردوم.....

هەروەک بڵێیت قەتادە (خوا لـیّ ی ڕازی بێت)دەیویست خۆشەویستی خێزانەکەی لە دەست نەچێت و ، لەگەڵی نەژێیت بە ڕووخسارێک کەیفی پێ نەیەت و خۆشی نەوێت ، هەروەک بڵێیت دەیویست خێرو چاکەی زۆربێت و ، هەروەها بگات بە چارەنووسی ودونیاو ڕۆژی قیامەت،ڕێگای بۆ ڕوونـاک بۆوە بەم ئایەتانەی خوای گەورە: [وابتغ فيما آتاك الله الدار الأخرة ،ولاتنس نصيبك من الدنيا ]....

هەروەها دەفەرموویت :[ربنا آتنا في الدنيا حسنة ، وفي الآخرة حسنة ، وقنا عذاب النار ، أولئك لهم نصيب مما كسبوا والله سريع الحساب].. لـە ئایـەتێکی تریـش دەفەرموویت [وماكان عطاء ربك محظورا]....

قـەتادە چاوی بڕیـە ئـەوەی چاوی چاک ببێتـەوە ،بۆ ئـەوەی کارەکـانی دونیـای پـێ ئەنجام بداو ،ببێت بە ئەهلی بەهەشتیش ،لـە ڕۆژی دوایـی خۆشیـەکانی تـەواو بکـات ، پێغەمبەری خواش ڕەزیلی بۆ پێ نەکرد ،دەستی درێژ کرد بۆ گـەورەیی خـوای دەسـەڵاتدار ،ئەمەش ڕێزلی گرتن بوو واتە ڕێزلێگرتنی موجـاهیدێکی ڕاستگۆیی دەستپاک .... ئـەم چاودێری یـە پێغەمبەرایەتی یـەی لەلایـەن گـەورەی ئـادەمیزاد بـۆ قـەتادە ، تووشـی خاکێکی بەرێزو چـاک بـوو کـەوا باشـترین بـە ڕووبوومـی بە دەست هێنـا ،یـەکێک لـە نیشانە پاکەکانی ئەوەبوو ، قەتادە پێغەمبەری خوای ﷺ زۆر خـۆش دەویـست و ، زۆر بـە توونـدی پابـەندی هـەڵس و کەوتـەکانی بـوو ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆژی ئوحـد بـە کەوانێک ئەوەندی تیر بۆ گاورەکان هاوێشت تاکو چەماوە ،کەڵکی بەکار هێنـانی نـەما قەتادە هەڵیگرت و پاراستی وەک بۆمـاوەکی بـە نـرخ و ئـازیز بـۆی بـوو بەیادگاری یـەکی بۆندار وخۆشەویست .

لە سیرەی بۆندار چیرۆکێک هەیە هەر لـە چیرۆکی قەتادەی کوڕی نەعمان دەچێـت: (ڕافعی کـوڕی مـالک) دەگێڕێتـەوە: کـاتێک جـەنگی بـەدر دەسـتی پێ کرد ،خەڵکەکە دەورەی (ئوبەیەی کوڕی خەلەف) یان دا ، منیش چوومە لای ،تەماشای پارچەیـەک لـە زرێیەکەم کرد لە بن هەنگڵیەوە پسـابوو ،شمشـێرێکم لـە شـوێنی پسـانی زرێیەکـەدا ، تـیرێکم لـە ڕۆژی بـەدر پـێ کـەوت ، چـاوم لـەگـەڵ ڕژا ، پێغەمبـەر ﷺ بـەناوی دەمـی لەشوێنی برینەکەی دام و دوعای بۆ کردم ، هیچ ئازارێکم پێیەوە نەدی......

ڕۆژگـار بەسـەرچوو ، قـەتادەی کوڕی نـەعمان گەیشـت بـە خزمـەتی پـەروەردگاری ،گەیشـت بـە بەهەشـت و ڕەزامـەندی خـوای گـەورە ، بـە حـەزی پـەروەردگاری جیهانیـانن... زەمـانی خەلیفـەی پێنجـەم ڕاشـیدنیەکان فـەرمانڕەوای دادپـەروەر (عومەری کوڕی عبد العزيز) هات (خوا لـیّ ی ڕازی بێت) ڕۆژێک پیـاوێک چووە لای و شانازی دەکرد بە هەندێک کردووەوە کەوا خەلیفەی ڕاشیدین گـوێی پـێ نـەدەدا ، پاش

کەمێکی تر یەکێک لە نەوەکانی قەتادەی کوڕی نەعمان چوو لای ،دەڵێن یەک لە نەوەکانی کەوا ناوی عاصم کوڕی قەتادە کوڕی نەعمان دەبێت ، هەندێکی تر دەڵێن ئەوی چووە لای کوڕی قەتادە بووە ،قەتادە کوڕێکی دەبێت بە ناوی (عمرو )کەوا فەرموودەی لی گێڕاوەتەوە هەروەک (نووی)باسی لی دەکات .... کوڕەکە چووە لای خەلیفەو پرسیاری لێ کرد خۆی بناسێنێ : تۆ کێیت ؟....منداڵەکە گووتی: ئەی ئەمیری بڕواداران، من کوڕی قەتادەی کوڕی نەعمانم ، باوکم بەیعەی عەقەبەی بینیوەو ، جەنگی بەدرو ئوحد و خەندەقیشی بینیوە ، لەگەڵ هەموو ئەم دیمانەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ........

پاشان منداڵەگە گووتی :-

| | |
|---|---|
| انا ابن الذی سالت علی الخد عینه | فردت بکف المصطفی احسن الـرد |
| فعادت کما کانت لاول امـــرها | فیا حسن ما عین ، و یا حسن ما رد |

واتە: [ من کوڕی ئەو کەسەم چاوی ڕژا سەر ڕوومەتی ، بە دەستەکانی پێغەمبەر گەڕاوە شوێنی خۆی بە باشترین گەڕانەوە ،گەڕاوە هەروەک جاری پێشووی ،ئەی لەبەر ئەم چاوە جوانەی ، وەی لە بەر ئەو گەڕانەوە جوانەی] .....

دەم وچاوی خەلیفەی پێنجەمی ڕاشدین بریقەی دایەوەو ،نێوچەوانی گەش بۆوە و ، نیشانەی کەیف حۆشی لی بەدیار کەوت ، پێشوازی لەم منداڵە کرد هەروەک ئەوی خشڵێکی بەدەست کەوتبێت ، یا خود بە خۆشەویستێکی ئازیزی گەیشتبێ ، هەروەک ئەوەی بەخەڵک ڕابگەیەنێت کەوا ئەمە شانازی یە ، ئەم دێرە هۆنراوەی (امیەی کوڕی ابی الصلت)ی بۆ هێنانەوە ، هەر وەکو دەڵێت :

| | |
|---|---|
| تلك المكارم ،لا قعبان من ابن | شیبا بماء فعادا بعد ابو لا!! |

واتە : ئەمەیە ڕێزلێنان ، نەوەک جامە شیرێک ،تێکەڵاوی ئاوی بکەن پاشان ببێت بە پیسایی ....

ئایادەبینین ؟....پێنجەم خەلیفەی ڕاشیدین ئەم شتەی گوتووە لەم شوێنەدا ،لەبەر ئەوەی دەیزانی ئیسلام مرۆڤ ناپێوێت بە بنەماڵەو ناوداری ،یاخود دەسەڵاتداری وسامان ،یان هێزو فەرمانڕەوایەتی .....بە ڵکو دەیپێوێت بەکردەوەکانی ،باشترین کەس لەلای ئەو کەسەیە خوا پەرستی بۆ پەروەردگار دەکات و ، شانازی بەم کردەوە چاکانە دەکات لە پێناوی خوای دەکات ، هەروەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت :[لیس لابن البیضاء علی ابن السوداء فضل ،الابالتقوی و العمل الصالح).......واتە: کوڕی سپی پێستێک بۆی نیە لە سەر کوڕی ڕەش پێستێک ،تەنها بە خوا پەرستی و کردەوەی چاک نەبێت ....

پێنجەمین خەلیفە ڕاشیدین گوێ بۆ داواکاری یەکانی نەوەی موجاهیدی تێکۆشەر قەتادە کوڕی ی نەعمان گرت ، زیاتر لەمەی دەیویست کارەکانی بۆ جێ بەجێ کرد ، پاش ئەوەی دەیەها و دەیەها ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر کۆچی دوایی قەتادە داهێنەری کردەوەی

چاک هەردەم بەختەوەرە ، لە هەڵبژاردنی پیاوەکانی ، هەرچەندە کات و زەمانەی بەسەردا بچێت .. بەم جۆرە قەتادە نیازی چاک کرد بۆ خوداو ، جیهادو خواپەرستی بۆ خودا کردو ، خوای گەورەش تاکو بەخۆی ڕادەگات نەوەکانیشی پاراست ، پاش ئەوەی قەتادەی شاد کرد بەبەهەشتەکەی ....

لێرەدا هەندێک بەڵگەهەن بۆ دڵسۆزی قەتادە زۆر لەبڕواو خواپەرستییەکانی پەند و ئامۆژگاری لێ وەردەگیرێ ، یەک لەم پەندانە ئەوەیە قەتادە زۆر سورەتی (الإخلاص) دەخوێندەوە ، هەروەک خوادەفەرمووێ :[ قل هو الله أحد ، الله الصمد لم يلد ولم يولد ولم يكن له كفوا" أحد ] ئەم سورەتەی دەخوێندەوە چەندەها جار ، بەتایبەتی لەکاتەکانی تەنهایی ، تاکو براکەی لە دایکی ( أبو سعیدی خودری) دەڵێت :.[ قەتادە بەشەو دەماوە ، ئەم شەوە هەمووی بە (قل هو الله أحد) دەبردەسەر ، ئەمەی باس کرد بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :[ والذي نفسي بيده انها لتعدل نصف القرآن –أو ثلثه] ..

واتە : بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ، ئەمە بەرامبەرە بەنیوەی قورئان ، یاخود سێیەکی ... هەروەک لە فەرموودەیەکی تر دێت پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەقەتادەی کوڕی نەعمان سورەتی : قل هو الله أحد ..ی دەخوێند ، دووبارەی دەکردەوە ، فەرمووی : وجبت واتە : بەهەشتی مسۆگەر کرد ....

لێرەدا ووشەی (وجبت) دەگەڕێتەوە بۆ بەهەشت ، واتە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت لەبەر ئەوەی لێرەدا خوێنەر سورەتی (توحيد) دەخوێنێ ، چونکە یەکتاپەرستی کۆڵەگەی ئایینە ، هەر کەسێکیش دڵ و دەروونی پڕبوو لە بیروباوەڕی یەکتاپەرستی لە کردەوەکانی بۆ خودای تاک و تەنیا دڵسۆز دەبێ ، بەم جۆرە ئەم ڕێگایە دەناسێت کە پێ دەچێتە بەهەشت ، ئنجا ئەم ڕێگایە دەگرێ و پێ پابەند دەبێ ، تاکو دەچێتە بەهەشتی نەعیم ....

ئەگەر سورەتی (توحيد) و ، شاهێدی (توحيد) دەروونی خاوەنەکەی ئاوەدان کردەوەو پێشڕەوی کرد بۆ سەر ڕێگای ڕاست ، ئەوا بۆی دەبێتە کلیلی بەهەشت ، هەروەک لە قسەیەکی (تەلحە) هاتووە !(ووشەیەکی گوێ لێبووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ (موجبە) واتە ووشەیەک وا لەخوێنەرە دڵسۆزەکەی دەکات بیبات بۆ بەهەشت ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی : من دەزانم ئەمە چییە ؟! ، (لااله الا الله) یە ...

یەکێک لە قسەکانی قەتادە کەوا بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزی نیازەکانی و ، ڕووی لە خوا دەکرد بە کردەوەکانی و ، دەڵێت :.(ان الله ليعطى العبد على نية الآخرة ما يسأله من الدنيا ، ولا يعطيه على نية الدنيا إلا الدنيا).

واتە: خودا دەبەخشێ بەبەندەی لەسەر نیازی ڕۆژی دوایی کەوا داوای دەکات لەدونیا ، شتێک نابەخشێت لەسەر نیازی دونیا تەنها دونیا نەبێت.

هەروەها قەتادە زۆر ڕقی لە ڕیابازی دەبۆوەو ، دەیزانی ترسناکییەکەی لەسەر

خاوەنە دوو ڕووەکەی ، هەروەک دەڵێت :[ إذا رأى العبد قال الله تعالى : انظـروا إلى عبدي يستهزىء بي] .

واته : ئەگەر بەندەک ڕیابازی کرد ، خوای گەورە پێی دەفەرمووێت : تەماشـای بـەندەی من بکەن سووکیم پێ دەکات .... ئینجـا قوڕبەسـەری بـۆ ئـەو کەسـەی سـووکی بـەخوای بەهێزی تۆلسێنەر دەکات ..!!

خواش پێیان دەفەرمووێت :[ ذلك جزاءهم جهنم بمـا كفـروا واتخـذوا آيـاتي ورسـلي هزوا ] ...

پاش ژیانێکی درێژو بەبەرەکەت ، قەتادەی کۆچـی دوایـی کـرد لـە شـاری مـەدینـە ساڵی ۲۳ کۆچی ، تەمەنی شەست و پێنج ساڵ بوو ، ئیمـامی عومـەر (خـوا لـێی ڕازی بێت) نوێژی لەسەر کرد ....

٢٦

# سەلمەی کوڕی
# ئەکوەعی ئەسلەمی

**موجاهیدی خاوەن**
**سێ بەیعە**

# سەلەمەی کوڕی ئەکوەعی ئەسلەمی

## موجاهیدی خاوەن سێ بەیعە

ئەمە گیان فیداو قارەمانێکی تری ئیسلامە .....
هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەرە ﷺ : باوکی عامر سەلەمەی کوڕی سنانی ئەسلەمی مەدەنی‌یە ، نازناوی (ئەکوەع)ە ، بانگی‌یان دەکرد بە باوکی مسلم ، یان باوکی ئیاس.
دەبینین کەوا مێژووی ئیسلامی پێی دەڵێت : (سەلە مە وەکو شێر بوو) پێشیان دەگووت :ـ(دەستێکی سپی بالای هەبوو) لە تێکۆشان وشەڕ .
ئیمام نووی دەربارەی دەڵێت : [ سە لەمە پیاوێکی ئازاو تیر هاوێژێکی چاک بوو ، لە هەموویان باشترو چاکتربوو] (ذهبی) دەربارەی دەڵێت : [ سەلەمە ئازاو قارەمان و ڕم وتیر هاوێژێکی چاک بوو ، زۆر جێ شوێنی بە ناوبانگی هەبوو ] .. سەلەمە ئاشقی جیهادبوو ، هەر کاتێک بۆی ڕێککەوتبایە دوا نەدەکەوت وسەلە لەکاتی تاریکی بوو گەپشتە ناو میسرو ، بە پیادە بە پێش ئەسپەکان دەکەوت .. هەروەک دەربارەی خۆی دەڵێت :ـ [ حەوت غەزام لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کردووەو ، نۆ غەزاش لەگەڵ زەیدی کوڕی حاریثە] ...
سەلەمە بەیعەی دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە بەیعەی (رضوان) ڕۆژی حودەیبیە ، ئەم بەیعەش بەیعەی مردن و ، بەیعەی پشت لە دوژمن نەکردن و ، بەیعەدان بوو لەسەر جیهاد تاکو شەهید بوون ، سەلەمە سێ جار بەیعەی دووبارە کردەوە جارێک لە پێشەوەی خەڵک ، جارێکی تر لە ناوەندیان ، جارێکی تریش لە کۆتایی یان ، مەبەستی لەم کارە ئەوەبوو بەیعەکەی تاکید بکاتەوە ، یان زیاتر لەزەت وخۆشی وەربگرێ بۆ ئەوەی زیاتر خۆی بۆ مردن لە ڕێگای خوا ئامادە بکات ....
لە ڕیوایەتێک دەگێڕنەوە سەلەمە دەڵێت : [ موبایەعەم دا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مردن لە ژێر دارەکە ، پاشان دوور کەوتمەوە ، کاتێک خەڵک کەم ماوە پێغەمبەر فەرمووی :ـ ئەی سەلەمە ، بۆچی موبایەعە نادەی؟
گووتم :ـ موبایەعەم دا ، ئەی پێغەمبەری خوا .
فەرمووی :ـ ئەمجارەش ....
منیش موبایەعەم کردەوە ....
پێغەمبەر ﷺ دەیویست جۆرە گەورەیی یەک بداتە سەلەمە بە دووبارە کردنەوەی ئەم بەیعەتە ....]
سەلەمە گیانێکی لە خۆبووردەیی و ئازایەتی هەبوو ، بەڵکو یەکێک بوو لە شارەزاترین تیر هاوێژەکان لەناو نەتەوەکەی و ، لێزانترین کەس لەشەڕکردن بە پیادە بوو نەک بە سواری ولاغ ، لەهەمووشیان زیاتر زۆرزان تر بوو بۆ ئەوەی فێڵ لە دوژمن بکات

و ڕێگایان پێ بگۆڕێ ، یەکێک لە نەریتەکانی لەکارە گیان فیدایی و ئازایی یەکانی ئەوە بوو ڕێگای فرت و فێڵی گرتبوو هەروەک پێغەمبەر ﷺ دەست نیشانی بۆ دەکات و دەفەرمووێت : [الحرب خدعة] واتە : شەڕکردن فرت وفێڵە .....

سەلەمە ئەگەر دوژمنەکانی پەلاماریان بۆ بهێنابایە خۆی وا نیشان دەدا کەوا لەبەر دەستی دوژمنەکانی هەڵدێت و ، بۆ پاشەوە دەگەڕاوە ، کاتێک دوژمنەکانی وازیان لە پەلامار دەهێناو ، هەوڵیان دەدا بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان ، یان پەنایان دەبردە بەر پشوودان ،سەلەمە پەلەی دەکرد بۆ پەلامارێکی لەناکاو و سەرکەوتوو ، کت وپڕ بەخێرایی دەگەیشتە سەریان و ، زیانی لە دوژمن دەداو ، ئەوەی پێوستبایە دەیکرد.. هەروەک لە فەرموودەیەکی صەحیح پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت :. [ باشترین پیادەمان سەلەمەی کوڕی ئەکوەعە ....]

لێی دەگێڕنەوە لە جەنگی [ ذی قرد] کاتێک عینیەی کوڕی حصنی الغزاری ، لەگەڵ ئەوەی عبداللەی کوڕی غطفان پەلاماریان هێنا سەر حوشترەکان لە جێگایەک دەکەوێتە باکووری مەدینە کە پێی دەڵێن (الغابة) ، پیاوێکیان کوشت کوڕی أبي ذري الغفاري بوو ، خێزانەکەیان بەدیل گرت ، ناوی (ليلى) بوو .

یەکەم کەس بەم دەست درێژەیەی زانی سەلەمەی کوڕی أکوع بوو ، لەبەر ئەوەی بەرەو (الغابة) دەهات ، کاتێک گەیشتە (ثنية الوداع ) ولاخی گاورەکانی بینی ، بینی چیان کرد ، یەکێکی ناردەوە بۆ ئەوەی ئەم هەواڵە بگەیەنێت بە پێغەمبەر ، خۆشی کەوتبووە دوای دوژمنەکانی و تیری وەهاوێشتنێ ، لە جولانەوەی دەخستن بە هۆی پەلاماردان و کشانەوەی بەرەنگاری دوژمنەکانی دەبووە لە چەند لایەک هار کاتێک لێدانێکی بۆ دوژمنەکانی دەکرد ، یان تیرێکی دەهاوێشت و ئەم دێرە هۆنراوەی دەخوێندەوە :

خذها وأنا الأكوع اليوم يوم الرضع

واتە : بگرەوە من کوڕی أکوەعم ئەم ڕۆژە ڕۆژی لەناوچوونی سپڵەو ناپیاوانە .. بەم جۆرە کوڕی ئەکوەع تێکۆشاو شەڕێکی نەبەردانەی کردو دەردێکی گەورەی دانێ ، زۆربەی ئەم شت و مەکەی بردبویان لێی سەندنەوەو ، هەرکە ئەم هەواڵە گەیشتە بەر گوێی پێغەمبەر بە پەلە کۆمەڵێک یاوەری موجاهیدی بۆ ڕەوانە کرد ، لێرەدا دوژمنانی خوایان شکاندو وانەیەکی باشیان دانێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی ڕێز لە سەلەمە بنێت لە کاتی گەڕانەوە لەگەڵ خۆی سواری ولاغەکەی کردو ، دەستی بەدەم و چاوی داهێناو داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد لەگەڵ دوعای خێر ..

با خودی خۆی کوڕی ئەکوەع ئەم ڕووداوەمان بۆ باس بکات ، هەروەک ئیمامی بوخاری و موسلیم بۆمان دەگێڕنەوە ، دەڵێت : پێش نوێژی بەیانی دەرچووم ، حوشترەکانی پێغەمبەر ﷺ لە (ذي قرد ) دەلەوەڕان ، یەکێک لە مندالەکانی عبدالرحمن کوڕی عەوف گەیشتە من و گووتی : حوشترەکانی پێغەمبەر ﷺ بردرا ...

پێم گووت : کێ بردی ؟
گووتی : غطفان
سێ جار هاوارم کرد :ـ واصباحاه ، لەنێوان هەردوو بەردەکەی مەدینە گوێیان لێ بوو ، پاشان بەرەو پێش ڕۆیشتم ، هەتا پێیان گەیشتم ، ئاویان دەخواردەوە ، ئەوانم دا بەر تیران ، بەردەوام تیرم بۆ هاوێشتن ، پێم دەگووتن : من کوڕی ئەکوەعم ، ئەمڕۆ ڕۆژی لەناو چوونی ناپیاوانە ، تاکو حوشترەکانم لێیان سەندەوە ، سی پارچە قوماشیشیان لەپاش بەجێما ... پێغەمبەرو خەڵکەکە هاتن ، پێم گووت : ئەی پێغەمبەری خوا ، بە تێنوێتی مانەوە ، با بکەوینە دوایان ... پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ـ ئەی کوڕی ئەکوەع سەرکەوتووی بەسەریان و وازیان لێ بهێنە : پاشان گەڕاینەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە پشت ولاغەکەی سواری کردم و ، هەتا گەیشتینەوە شاری مەدینە ..
هەروەها ئەم ڕووداوە لە ڕیوایەتی هەردوو ئیمام أحمد و مسلم بەجۆرێکی ڕوون ترو درێژتر دەگێڕنەوە کەوا کوڕی ئەکوەع دەگێڕێتەوە ودەڵێ :ـ
من و پێغەمبەری خوا ﷺ چووینە شاری مەدینە لە کاتی حودەیبیە بوو ، من و ڕەباح سەرکاری پێغەمبەر ﷺ بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ولاغی (تەلحەی کوڕی عبیدالله) شمان لەگەڵ خۆمان برد بە مەبەستی ئاودانی حوشترەکانی پێغەمبەر ﷺ .
کاتێک لە (غلس) بووین عبدالرحمن کوڕی عینیە هێرشی هێنا سەر حوشترەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ شوانەکەی کوشت و ، خۆی و کۆمەڵەکەی لەگەڵی بوون بە سواری وولاغ بوون حوشترەکانیان بە پێشە خۆیان دابوو ، منیش گووتم : ئەی ڕەباع ، سواری ئەم ئەسپە بەو ، بیبەوە بۆ تەلحە بە پێغەمبەری خواش ڕابگەیەنە ﷺ کەوا هێرش و پەلاماریان هێناوە بۆ سەر حوشترەکانی .
چوومە سەر گردێک و ، ڕووم لە مەدینە کرد ، سێ جاران بانگم کرد : یا صباحاه ..
پاشان کەوتمە دوای کۆمەڵەکە ، شمشێرو تیرم لە لابوو ، تیرم بۆ دەهاوێشتن و ولاغەکانم بریندار دەکردن ، کاتێک دارو درەختمان زۆر دەهاتە پێش ، سوارەکان دەگەیشتنە لام دەچوومە سەردارەکان ، پاشان تیرم بۆ دەهاوێشتن ، هەر سوارێک دەهاتە پێشم بریندارم دەکرد ئەم کاتەی تیرم بۆ دەهاوێشتن دەمگووت : من کوڕی ئەکوەعم ، ئەمڕۆش ڕۆژی بە هیلاک چوونی ناپیاوانە .....
گەیشتمە پیاوێکیان تیرم بۆ هاوێشت کاتێک لەسەر پشتی ولاغەکەی بوو ، تیرەکە بە پشتی پیاوەکە کەوت ، پێم گووت : بگرە من کوڕی ئەکوەعم ، ئەمڕۆ ڕۆژی بەهیلاک چوونی ناپیاوانە کاتێک دەکەوتینە ناوداران بە تیران دەم سوتاندن ، کاتێک دەکەوتنە ناو دۆڵ لێیان بەسەر چیا دەکەوتم و بەردم بۆ دەهاوێشتن ، تا ئەو کاتە ئەوە ئیشی من وئەوان بوو ، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتێ و منی لە پشت ولاغەکەی خۆی سوار کرد ، لەبەر دەستیان ڕزگاریم بوو ..
پاشان بەردەوام ڕمیان بۆ دەهاوێشتم تاکو سی ڕمم بۆ هات و ، سی بوردەیان

لەپاش بەجێما ، هەر شتێکیان لێ دەکەوت منیش بەردێکم لەسەر دادەناو ، کۆم دەکردەوە لەسەر ڕێگای پێغەمبەری خوا ﷺ ......

کاتێک ڕۆژهەلات عینیە کوڕی بدری فزازی هات بە هانایان ، لەناو دۆلێکی تەسک بوون ، پاشان من لێیان چوومە سەرچیا واتە سەر سەریان ، عینیە پێی گووتن : ئەوەکێیە تەماشاتان دەکات ؟

گووتیان : تووشمان بە تووشی ئەم پیاوە بووە ، لە بەیانییەوە وازی لێ نەهێناوین ، هەموو شتێکی لێ سەندووین ، هەمووی لە پشتە خۆی داناوە .

عینیە پێی گووتن :۔ئەگەر ئەمە شتێکی لە دواوە نەبێ وازی لێ دەهێنان ، با هەندێک لە ئێوە بۆی دەرچن.

پێم گوتن : ئایانازانن من کێم ؟

گووتیان : تۆ کێی ؟

گووتم :۔ من کوڕی ئەکوەعم ، بەو خوایەی موحەممەدی ڕێز لێناوە هەریەکێک بگاتە لای من نامگاتێ و ، منیش هەر کەسێکم بوێ دەیگەمێ .

یەکێک لە پیاوە کان گووتی : من گومان نابەم ڕاست بکات .

هێشتان جێگای خۆم بەجێ نەهێشتبوو کاتێک تەماشام کرد سوارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نێو دارەکان دەهاتن . یەکەم سواریان (أخرم الأسدي) بوو ، أبو قتادە سوارچاکی پێغەمبەری خوا ﷺ بەدوایدا دەهات ، لە دوای ئەویش (المقدادکوڕی أسودی کندی) بوو ، بێ بڕواکان هەرکەبینیان پشتیان هەڵکردو هەڵاتن لەسەر چیایەکە هاتمە خوارەوە جڵەوی ئەسپەکەی ئەخرەمم گرت ، گووتم :۔ئەی ئەخرەم ، ئاگادار بە وازیان لێ بهێنە من دەترسم لەبەر دەستیان ڕزگاریت نەبێ ، ڕاوەستە تاکو پێغەمبەری خواو ﷺ یاوەرەکانی دەگەنێ ....

پێی گووتم : ئەی سەلەمە ، ئەگەر بڕوات بەخواو ڕۆژی دوایی هەیەو دەزانی بەهەشت هەیەو دۆزەخ هەیە ، مەبە پەردە لە نێوان من و شەهادەت ....

منیش جڵەوی ئەسپەکەم بەردا ، گەیشتە عبدالرحمن کوڕی عینیەو ، عبدالرحمن بۆی سوڕاوە ، لە یەکتریان دا ، ئەخرەم ولاغەکەی (عبدالرحمن)ی بریندارکرد ، (عبدالرحمن) یش لەوی داو شەهیدی کرد ، أبو قتادە گەیشتە عبدالرحمن و ، عبدالرحمن لە ولاغەکەی أبو قتادەی داو ، أبو قتادەش ئەوی کوشت ، أبو قتادە سواری ولاغی ئەخرەم بوو ....

پاشان من کەوتمە دوای کۆمەڵەکە ، تاکو لەبەر تۆزی ولاغی یاوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ هیچ شتێکم نەبینی ، پێش ڕۆژئاوابوون چوونە جێگایەک ئاوی لێبوو ناوی (ذی قرد) بوو ویستیان ئاوی لێ بخۆنەوە ، منیان بینی لە دوایانم ، وازیان لە ئاو خواردنەوە هێنا ، چوونە سەر بڵندایی بیرکە .

ڕۆژئاوا بوو ، گەیشتمە پیاوێکیان تیر هاوێژم کرد ، پێم گووت : بگرە من کوڕی

ئەکوەعم ، ئەمڕۆ ڕۆژی بە هیلاک چوونی ناپیاوانە .....
گووتی : ئەی لەدایک بەجێ ماو ئەکوەعەکەی بەیانی یت .
پێم گووت : بەڵێ ، ئەو دوژمنەی ئێوەم ، ئەی لە دایک بەجێ ماو ، من ئەکوەعەکەی بەیانیم تیرێکی ترم بۆهاوێشت دوو تیری پێ کەوت ، دوو ئەسپی بەجێهێشت ، هەردوو ولاغم هاژوشت و بردم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، کەوا لەسەر ئەو ئاوە بوون ئەمهێشت گاورەکان ئاو بخۆنەوە ناوی : ( ذي قرد ) بوو ، پێغەمبەری خواو ﷺ پێنج سەد یاوەری لەگەڵ بوو ، بیلال کوشتراوێکی لەدەست بوو کەوری دەکردو ، سۆری دەکردەوە بۆ پێغەمبەرو یاوەرەکانی .
هاتمە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێم گووت :ـ ئەی پێغەمبەری خوا ، ڕێگام بدە سەد یاوەری خۆتم و بدیَ و ، کاتی عیشا بەم گاورانە دەگەم و ، تابێت یەک کەسیان لی بمێنیَ هەوالیشیان بۆ بباتەوە ..!!
پێغەمبەر ﷺ پیَ ی گوتم :ـ ئەوەی کردی تۆ کردت ئەی سەلەمە ؟
گووتم : بەڵێ ، بەو خوایەی تۆی گەورە کرد .
پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی بردەوە تاکو ددانەکانی بەدیار کەوت ، پاشان گووتی ئەوان ئێستا لە خاکی غەتفانن ، ... پیاوێک لەلای غەتفان هات و گووتی ، ئەمانە بەلای پیاوێکی غەتفانی دا ڕۆیشتن ، ئەویش حوشترێکی بۆ سەربرین ، کاتێک حوشترەکەیان کەور دەکرد .
هەستی ئێوەیان کرد ، حوشترەکەیان بەجێهێشت و ، هەڵاتن .
کاتێک بەیانیمان کردەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :ـ [ خير فرسانا أبو قتادة ، وخير رجالتنا سلمة ] .
واتە باشترین سوارچاکمان ( أبو قتادە ) یەو ، باشترین پیادەشمان سەلەمەیە ....
پێغەمبەری خوا ﷺ دوو بەشی ئەم غەنیمانەی دامیَ ، یەکێکیان لە جیاتی سوارچاکی وئەوی تریان لە جیاتی پیادە ، پاشان لە پشت حوشترەکەی سواری کردم ، کەناوی (عضباء) بوو و ، گەڕاینەوە شاری مەدینە ....
کاتێک تازە ڕۆژ ببۆوە ، پیاوێک لە ئەنصاری یەکان کەس لە پێشبڕکیَ نەیدەگەیشتیَ ، بانگی کرد .
کەس هەیە پێشبڕکیَ بکات ؟ کەس هەیە لەگەڵم پێشبڕکیَ بکات بۆ مەدینە ؟ چەند جاران دووبارەی کردەوە ، منیش لە دوای پێغەمبەری خوا سواری حوشتر ببوم ، پێم گووت : ئایا تۆ ڕێز لە بەڕێزان ناگریت ؟
گووتی : نەخێر ، تەنها پێغەمبەری خوا نەبێت ﷺ .
گووتم : ئەی پێغەمبەری خوا ، دایک و باوکم بە قوربانت بێت ، ڕێگام بدە پێشبڕکیَ لەگەڵ ئەم پیاوە بکەم .
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : چۆنی حەز دەکەیت وابکە .

- پیاوەکەم دووت : دێم بۆ لات .
ئەوەبوو پێم سوڕاند لەسەر پشتی حوشترەکەو ، پاشان یەک دوو ماوەش پیاوەکەم بە پێشە خۆم دا ، ئینجا کەوتمە دوای و ، لە نێوان هەردوو شانەکانم دا ، پێم گوت سوێند بەخوا بە پێشت کەوتم .
پێکەنی و گووتی :ـ وابزانم .
تاکو گەیشتینە شاری مەدینە .
ئیتر بەم جۆرە سەلەمەی کەوری ئەکوەع باسی یەک دوو هەڵوێست لە هەڵوێستەکانی قارەمانیەتی خۆی دەکا ، بۆمان دەردەکەوێت ئەم کەلە پیاوە قارەمانانە ، چۆن بە ئەرکەکانی خۆیان هەڵساون و چۆن هەموو کاتێک ئامادە بوونە بۆ ئەوەی بگەن بە دوژمنەکانیان و بەرگری لە ئیسلام بکەن !!
سەلەمەی کوڕی ئەکوەع هەموو کات بە دوای خۆشی دونیا نەکەوتووە ، نەترسایە لە ماندوو بوون و ناخۆشی و ، خەمی نەخواردووە لە شتێک کەلە دەستیان چوو بێت ، بەڵام کاتێک براکەی عامری کوڕی ئەکوەع وای گومان برد کەوا پلەی شەهادەتی لە دەست داوە ، زۆر خەمی خوارد .
عامر وەکو موجاهیدێک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ ڕۆیشت بۆ جەنگی خەیبەر ، ئەم سروودە جیهادیەی دەگووتەوە :

اللهم لو لا انت ما اهتدينا ولا تصدقنا ولا صلينا
فاغفر فداء لك ما أبقينا وأنزلن سكينة علينا
وثبت الأقدام ان لاقينا إن الألى قد بغوا علينا
وبالصياح عولوا علينا اذا أرادوا فتنة ابينا

پێغەمبەر گوێ لەم سروودە بوو ، فەرمووی : کێیە ئەم سروودە لێ ؟
گووتیان : عامری کوڕی ئەکوەعە .
پێغەمبەر فەرمووی : یرحمه الله .. واتە : خوا ڕەحمی پێ بکا
عومەری کوڕی خەتاب گووتی :ـ دوعاکەت قەبوڵ بوو ئەی پێغەمبەری خوا ، ئەم تامی شەهادەت دەچێژێت . ئەوەبوو لەم جەنگەدا عامر ویستی لە یەکێک لە دوژمنە جولەکەکان بدات ، لایەکی شمشێرەکەی سوڕاوە ، بە خۆی کەوتەوە ، عامر پێی مرد ، هەندێک لە خەڵکان گووتیان ، کردەوەی عامر بەتاڵ بۆوە ، خۆی کوشت و ، لە شەهادەت بێ بەش بوو !!
سەلەمە گوێی لەم قسانە بوو ، دونیای لە پێش چاوی تەسک بۆوە ، لە ترسی چارەنووسی براکەی لە ڕۆژی دوایی ، لەبەر ئەوە زۆر خەمی خوارد ، گریاو ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک پێغەمبەر پرسیاری لێی کرد بۆچی دەگرێی ، ئەویش پێی گووت : خەڵک دەڵێن کردەوەی عامر بەتاڵ بووە ....
پێغەمبەر وەڵامی دایەوەو کەیف خۆش و بەختیاری کرد ، پێی گووت : ئەوانە درۆ

دەکەن ، بەڵکو دوو پاداشی بەدەست هێناوە ، عامر ئێستا لەناو ڕووبارەکانی بەهەشت مەلە دەکات .....

لێرەدا سەلەمە دونیای لە پێش چاوی ڕووناک بۆوەو گەڕاوە ، زۆر زۆر کەیف خۆش بوو ، چونکە دڵنیا بوو براکەی مردووە بە شەهیدی ، بەمردنی ترسنۆکانە نەمردووە ، ڕەحمەتی خواو ڕازی بوونی خوا لەم تەرزە پیاوە بەوەفایانە بێت .....

هەروەک ئەوەی سەلەمە لە پێشەوەی هەموو کەس بووە لە جیهاد و تێکۆشان ، لەگەڵ ئەمەشدا پیاوێکی بەخشەر بووە ، هەروەک نەفس و خوێنی خۆی بەخشیووە ، ماڵی خۆشی بەم جۆرە بەخشیوە ، هەموو کاتێکیش هەوڵی داوە کارەکانی بە پاکی و.

هەر کەسێک داوای لی بکردبایە بیگووتبایە :- داوات لی دەکەم لە ڕاهی خودای ، ئەوا کارەکەی بۆ جێ بەجێ دەکردو ، هەموو توانایەکی بۆ بەکار دەهێناو دەیگووت :- [ئەگەر یەکێک لە ڕاهی خوای نەبەخشی ئەی لە ڕاهی کێ ببەخشێت ؟] .

لەگەڵ ئەم هەموو کردەوە چاکانەو ، ئەم هەموو بەخشینە ، سەلەمەی کوڕی ئەکوەع لە ئایین شارەزاو فەرموودەناس بووە ، لە پێغەمبەری خوای ﷺ حەفتاو حەفت فەرموودەی گێڕایتەوە ، بوخاری و موسلیم لە شانزە ڕیوایەتان یەک قسە بووینە ، هەموو فەرموودەکانی تریش هەر یەکێک لە بوخاری و موسلیم بەتەنها ڕیوایەتیان کردووە .

سەلەمە گەیشتبووە ئاستێکی ئاوەها لە زانستی ئایینی ، یەکێک بوو لەوانەی فتوای بۆ خەڵک دەدا لەشاری مەدینە ، لەگەڵ ئەم سیفاتە بەرزانە ، سەلەمە بەناوبانگ بوو بە بڕوادارێک کەوا پابەند بوو بەخووڕەوشتی بەرز ، باگوێ لە کوڕە ڕاستگۆیەکەی بگرین دەربارەی باوکی دەڵێت : (باوکم لە ژیانی درۆی نەکردووە . . ) درۆ ڕیسوایی یەکی ئەوەندە گەورەیە ، پێغەمبەر پێمان ڕادەگەیەنێ نابێ بڕوادار ئەم سیفەتەی لی بێتە جێ و ناوبانگی پێ دەربچێت ....

بەم جۆرە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ناو نیشان وسەرمەشقی موجاهیدی مسوڵمانە کەوا هەموو سیفاتەکانی سوارچاکی گۆڕەپانی جەنگ و ، ڕاستگۆیی لە ئیمان و ، دڵسۆزی لە کارو ، پابەند بوون بە ڕەوشتی بەرزی لی کۆبۆوە ....

پاش شەهید کردنی ئیمامی عوسمان خوا لی ی ڕازی بێت ، سەلەمە ترسا لەوەی ئەم فیتنەیە ئەویش بگرێتەوە ، لەبەر ئەوە ڕووی لە بیابان کردو جێنشین بوو تاکو پێش مردنی بەچەند ڕۆژێک ، گەڕاوە مەدینەو ، لەسالی حەفتاو چواری کۆچی دا کۆچی دوایی کرد ، کاتێک تەمەنی گەیشتبووە هەشتا ساڵ خوای گەورە لە موجاهیدی خاوەن سێ بەیعە سەلەمەی کوڕی ئەکوەع ڕازی بێت .......

٢٧

# خالیدی کوڕی سەعید

لەگەڵ ڕووناکی ئیسلام
موجاهید بوو

﴿ ٢٧ ﴾

# خالیدی کوڕی سەعید

## لەگەڵ ڕووناکی ئیسلام موجاهید بوو

لەماڵێکی پڕ لە خۆشی و بەرەکەت ، باوک و باپیرانێکی دەسەڵاتدار ، لە باوکێک جێگاو شوێنی هەبوو لە نێو قورەیش ، (خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص) لە دایک بوو ، ئەگەر حەز دەکەیت زیاتر لە بنەماڵەی بکۆڵیتەوە ، بڵێین :-
کوڕی ئومەیە ، کوڕی عەبد شەمس ، کوڕی عەبد مەناف .......

هەر لەم ڕۆژەی تیشکی ڕووناکی تیشکی دایەوە لە شاری مەککە بە ئاسپایی و شەرمەوە ، بەبێ دەنگی یەک کەوا (موحەمەدی دەستپاک) باسی ئەم نیگایە دەکات کەلە ئەشکەوتی (حراء) بۆی کراوە ، هەروەها دەربارەی ئەم پەیامەی کەوا پێی گەیشتووە لە لایەن خوا ، بۆ ئەوەی بە بەندەکانی ڕابگەیەنێت ، دڵی خالید ئەم ڕووناکی یە بێ دەنگەی پێ گەیشتوو گوێی لێ بوو و لەکاتێکدا ئامادە بوو بۆی....
دەروونی لە خۆشیان باڵی گرتبوو ، هەروەکو بڵێیت ئەم پەیامە لەسەر کاتی خۆیەتی و لەبەر ئەوە خالید بەدوای تیشکی ئەم ڕووناکی یەدا دەگەڕا لەکاتی دەرچوونی و ڕۆیشتنیدا ....هەر کاتێک گوێی لە کۆمەڵێک دەبوو لە میللەتەکەی ، باسی ئەم ئایینە نوێیەیان دەکرد ، لەگەڵیان دادەنیشت ، بەهێمنی و بێ دەنگی یەوە گوێی بۆ شل دەکردن ، ساتێک دوای ساتێک قسەکانیان خۆشتر دەبوو بە ووشەیەک یان چەند ووشەیەک ، پاڵی پێوە دەنان بۆ ئەوەی بڵاو ببێتەوەو ، کاری خۆی بکات ...

لەم کاتانەدا یەکێک چاوی بە خالید کەوتبایە ، دەیبینی گەنجێکی هێمنی لە سەرەخۆو ، زیرەکێکی کش ومات ، بەڵام خالید لەناوەو ژوورەوەیدا ، بە پێچەوانەوە بریتی بوو لە میهرەجانێکی پڕ لە جووڵەو کەیف خۆشی و ، بەزم و ڕەزم و گووتنی هەڵبەست و سروود ، جەژنێک بە هەموو جوانی جەژنان و پڕ لە خۆشی و گەرمی جەژن.

ئەم گەنجە ئەم جەژنە گەورەی لە دڵ و دەروونی هەڵگرتبوو و ، ئەم نهێنی یەی دەپاراست ئەگەر باوکی ئاگادار بوایە ، خالید ئەم نهێنی یەی لە دڵی هەڵگرتووە بە شێوەیەکی وا گەرم گوڕ بانگی موحەممەدی بۆ دەکات ، ژیانی کۆتایی پێ دەهێناو ، دەیکرد بە قوربانی بۆ خواکانی عبد مناف .... بەڵام دەروونەکانمان کاتێک جۆش درا بە فەرمان ، گەیشتە ڕاددەی پڕ بوون ئەوا گەڕانەوەی بۆنیە ، بۆ ئەوەی جارێکی تر پاڵی پێوە بنێن ..!!

بەڵام نەخێر .... ڕۆژ جارێکی تر هەڵنایەتەوە ، خالید تاکو نێستا لە خەو ڕابووەو ، دەگەڕێ بە دوای خەونە توندو قوڕسەکانی ، کەوا زۆر بەکارو بزندار بوون ....!!

ئنجا دەڵێین : شەوێک لە شەوان ، خالیدی کوڕی سەعید لە خەودا دەبینێ ،

وەستاوە لە قەراغ ئاگرێکی گەورە ، باوکی لە پشتەوەی بەهەردوو دەستیکانی پالی پێوە دەنێت ، دەیەوێت فڕێی بداتە ناو ئاگرەکە ، پاشان پێغەمبەری خوا دەبینێت ڕووبەڕووی دێت ، بە دەستی ڕاستی پیرۆزی جلەکانی دەگرێ و ڕایدەکێشی و ، دەیگرێ و دووری دەخاتەوە لە ئاگرو بلێسە .....

خالید لەخەو هەڵسا ، بە هەڵسانێک پڕ بوو لە دارشتنی کار بۆ ڕۆژێکی نوێ ، یەکسەر پەلەی کرد بۆ مالی (أبوبکر) ، خەونەکەی بۆ گێڕایەوەو ، کەچی خەونەکە پێویستی بەلێکدانەوە نەبوو ....

ئەبوبەکر (خوا لی ی ڕازی بێت) گووتی :

[ ئەوە چاکەیە تۆی دەوێت ، ... ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ بەدوای بکەوە ، ئیسلام دەتپارێزێت لە ئاگر]

(خالید) دەرچوو ، بۆ گەڕان بەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ تاکو دۆزیەوەو پی ی گەیشت ، پرسیاری لە پێغەمبەر کرد دەربارەی بانگەکەی ، ئەویش سەلامی خوای لی بێت وەلامی دایەوەو فەرمووی :-

[ وتؤمن بمحمد عبده ورسوله .... وتخلع عبادة الأوثان التي لاتسمع ولا تبصر ، ولاتضر ولا تنفع] ....

واتە : بڕوا هێنان بە خوای تاک و ، هیچ هاوەڵێکی بۆ پەیدا نەکەیت ، بڕوا بهێنیت بەموحەممەد بەندەو پێغەمبەری خوایە ... وازبهێنیت لە بەندایەتی بۆتان کەوا نەگوێ ی لی دەبێ و نەدەبینیت و ، نەزیانی هەیەو نەقازانج ] ..

خالید دەستی ڕاستی درێژکرد ، لە ناو دەستی راستی پێغەمبەری خوای ناو ﷺ بەگەرمی ، خالید گووتی : [من شاهێدی دەدەم هیچ خوایەک نیە تەنها (اللـه) نەبێت... وەشاهێدی دەدەم موحەمەد پێغەمبەری خوایە ...!!] سروودو هۆنراوەکانی دەروونی دەستیان بە خوێندن کرد .

ئەم میهرەجانەی کەوا شاردبیەوەو نهێنی بوو ئاشکرا بوو ... هەواڵ گەیشتە باوکی ..

ئەم ڕۆژەی خالید مسولمان بوو ، کەس بە پێشی نەکەوت بۆ ناو ئیسلام تەنها چوار پێنج کەس نەبێت ، کەواتە سەعید پێنجەمین کەسێکە کەوا هاتە ناو ئیسلام و مسولمان بوو ، ئەو کاتەی یەکێک لە مندالەکانی سەعیدی کوڕی عاص هاتە ناو ئیسلام و مسولمان بوو ، ئەم کارە بە بیروڕای سەعید - کارێکە تووشی ڕیسوایی و گالتە و گەپی دەکات لە نێو قوڕەیش ، زەوی لە ژێر گەورایەتیکەی دەلەرزێ ....

بەم جۆرە بانگی خالیدی کردو ، پی ی گووت :-[ ئایا ڕاستە تۆ بەدوای موحەممەد کەوتوویی و ، تۆ گوێت لی دەبێ و نەنگ بە خوایەکانمان دەگری ... ؟؟]

خالید گووتی :

[ سوێند بە خوا ئەمە ڕاستە ..... بڕواییم پی ی هێناوەو بە دوای کەوتووم ] .

لێرەدا باوکی پەلاماری داو بەلێدانێک کەوتە سەری ، پاشان فڕێ ی دایە ناو

ژوورێکی تاریکی ماڵەکەی ، بەندی کرد ، پاشان ئازارو ئەشکەنجەی دا بە برسیەتی و تێنوویەتی ....
خالید لە پشت دەرگا داخراوەکە ، هاواری دەکردە سەریان و دەیگوت :.
[ واللە إنه لصادق ، وإنی به لمؤمن ] ..
واتە :[ سوێند بەخوا پێغەمبەر ڕاست دەکاو ، من بڕوایيم پیێ هێناوە ] .
دووبارە سەعید چۆوە گیان کوڕەکەی و بەم ئازارو ئەشکەنجەیە وازی نەهێنا ، بردیە بیابانی مەکە ، ڕای دەگرت لەنێو بەردە گەورە سووربووەکان ، بۆ ماوەی سێ ڕۆژ سێبەری پیێ نەدەکەوت ....!!
لێوەکانی تەڕ نەبوو بە دڵۆپێک ئاو ...
باوکەکە لە منداڵەکەی نا ئومێد بوو ، گەڕاندیەوە ماڵەوە ، جارێک هەڵیدەخەڵەتاند بەسامان و ، جارێکی تر دەیترساند .... بەڵێنی دەدایێ و دووبارە دەیترساندەوە ... خالید خۆڕاگر بوو وەکو هەق ، بەباوکی گووت :.
[ لن أدع الاسلام لشيء ، وسأحيا به ، وأموت عليه ] ....
واتە : وازلە ئیسلام ناهێنم بۆ هیچ شتێک ، لەسەری دەژیم و ، لەسەری دەمرم ..
سەعید هاواری لەسەر کردو گووتی :.
[کەواتە لەلام بڕۆ ئەی هیچ ، سوێند بەلات ڕۆژیت لیێ قەدەغە دەکەم ] خالید وەڵامی دایەوەو گووتی :[ ....واللە خیر الرازقین] ..!!
ئەم ماڵەی بەجێهێشت کەوا ژیانێکی خۆشی ، لە خواردن و جل وبەرگ ڕادەبوارد .... بەجیێی هێشت بۆ هەژاری و نەبوونی ..
بەڵام چ ئازارێک .... ؟؟
ئایا ئیمانی لەگەڵ نیە ... ؟؟
ئایا ڕێزی لە ویژدانی خۆی نەناوەو نەیپاراستووەو ، هەروەها لەگەڵ هەموو مافەکانی لە چارەنووسی ؟؟
کەواتە برسیەتی چییەو ، هەژاری چییەو ، سزا چییە ؟؟
وە ئەگەر مرۆڤ دەروونی خۆی دۆزیەوە لەگەڵ ئەم ڕاستی یە مەزنە هەروەک ئەم ڕاستیەی کەوا موحەممەد پێغەمبەری خوا بانگی بۆ دەکات ، ئایا لە هەموو جیهان شتێکی بە نرخ ماوە بۆ ئەوەی بەدەستی نەکەوێت ، لە کردەوەیەک خوای گەورە خاوەنیەتی ..!!
بەم جۆرە (خالیدی کوڕی سەعید ) سەرکەوت بەسەر سزاو قوربانی ، هەروەک بەسەر هەژاری و نەبوونیش سەرکەوت ... کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە یاوەرە بڕوادارەکانی کرد ، بۆ کۆچی دووەم بۆ حەبەشە ، خالید کوڕی سەعید یەکێک بوو ، لەمانەی ئامادەی کرد بۆ ئەم کۆچە .
(خالید ) لەم شوێنەدا ماوە ئەوەندەی خوا حەزی کرد ، پاشان لەگەڵ هاوڕێکانی

گەڕاوە بۆ نیشتمانەکەی ، ساڵی حەفتی کۆچی ، مسوڵمانانیان بینیەوە تازە لەفەتحی خەیبەر دەبورنەوە
(خالید) جێنشین بوو لە شاری مەدینە لە ناوەڕاستی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی نوێ ، کەوا یەکێک بوو لەم پێنج کەسانەی دروست کەری ئەم کۆمەڵگایە بوون و ، هەر غەزایەک کرا بێت ، هەر دیمانەیەک کرا بێت ، ئەوا (خالیدی کوڕی سەعید) لە پێشەنگەکانی بوو ...
(خالید) بەم پێشبرکێیەی لە هاتنە ناو ئیسلام و ، بەراست ڕۆیشتنی ویژدان و لانەدان لە ڕێبازەکەی ، ببووە جێگای خۆشویستن و ڕێز لی گرتن .
خالید ڕێزی لە بڕوایی یەکەی خۆی دەناو ، فێڵی لی نەدەکردو بە هیچ جۆرێک لی ی دانەدەبەزی و داکۆکی لەسەر دەکرد :.
پێش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ کردبووی بە فەرمانڕەوا لەسەر یەمەن ..... کاتێک هەواڵی گەیشتنی جێنشین بوونی ئیمامی ئەبوبەکری بیست بە خەلیفەی مسوڵمانان و موبایەعەیان کرد ، کارەکەی بەجێهێشت و گەڕاوە بۆ مەدینە ........
لەگەڵ ئەوەی دەیزانی ئەبو بەکر چ گەورەیی یەکی هەیە لەسەری کەوا گەورەیی وەک ئەم گەورەیی یە وێنەی نیە...!! وای دەزانی و وای تێدەڕوانی یەکێک لە نەوەکانی (بنی هاشم) ببێت بە خەلیفەی مسولمانان بۆ نموونە (عەبباس) یان (عەلی کوڕی أبی تالیب) .... وەستا بەرامبەر ئەم قەناعەتەی خۆی و ، موبایەعەی نەدا بە ئیمامی ئەبو بکر .....
ئیمامی ئەبو بکر بەردەوام خۆشی دەویست و ، ڕێزی لی دەنا ، ڕکی لی نەدەبۆوە لەبەر ئەوەی نەبوو موبایەعەی نەدەدا ، یان موبایەعەی دەدا ، هەر کاتێک لە نێوان مسولمانان باسی بکرابایە ئەوا خەلیفەی مسولمانان باسی بە چاکە دەکرد و دوعای خێری بۆ دەکرد .....
پاشان قەناعەتی خالیدی کوڕی سەعید گۆڕاو ، ئەوەبوو ڕۆژێک ڕیزەکانی نوێژ کەرەکانی بڕی لە مزگەوتداو ، ئیمامی ئەبو بەکر لەسەر مینبەر بوو ، موبایەعەی دا بەئەبو بەکری پێشەواو بە بڕوایی و ڕاستگۆیی ...
لە کاتێکدا ئیمامی ئەبو بەکر سوپاکانی بەرێ دەکرد بۆ وڵاتی شام ، ئاڵای دابووە دەست خالیدی کوڕی سەعید ، ببوە یەکێک لەسەر کردەکانی سوپا
بەڵام پێش ئەوەی هێزەکان بەرێ کەون لە شاری مەدینە ئیمامی (عمر) خوا لی ی ڕازی بێت ڕازی نەبوو بەفەرمانڕەوایەتی (خالیدی کوڕی سەعید) ، لەبەر ئەوە زۆر داوای لە خەلیفەی مسولمان کرد فەرمانەکەی بگۆڕێت بە گۆڕینی فەرمانڕەوایەتی خالید ..
ئەم هەواڵە گەیشت بە خالید ، لەمەی زیاتر نەگووت :.
[ سوێند بەخوا ،فەرمانڕەوایتیان کەیف خۆشی نەکردوومەو ، لادانیشتان دڵ تەنگی نەکردوومە ]
ئەبو بەکری ڕاستگۆ (خوای لی ی ڕازی بێت) چووە ماڵی خالد داوای لێبووردنی کرد ،

هەروەها ئەم هەڵوێستە نوێیەی بۆ شی کردەوە ، پرسیاری لی کرد لەگەل ئام لە ئەمیر
سەرلەشکرەکان دەبیت ، حەز دەکەیت لەگەڵ (عەمری کوڕی عاص) بێت . کەوا
کوڕەمامی بوو .؟ یان لەگەڵ (شورحەبیلی کوڕی حسنە) ؟
خالید وەلامێکی وای داوە بەلگە بوو بۆ دەروون بەرزی لە خواترسی :.
[ کوڕە مامم ، لەبەر ئەوەی نزیکمە خۆشم دەوێت ، بەلام شورحەبیل ، لەبەر ئەوەی خۆشم دەوێت برای دینیمە] ..
پاشان هەلیبژارد کەوا سەربازێک بێت لە کەتیبەی (شورحەبیل کوڕی حسنە) .
ئیمامی ئەبو بکر داوای لە شورحەبیل کرد پێش ئەوەی سوپا بەرێ کەوێت ، پێی گووت :.
[ تەماشای خالیدی کوڕی سەعید بکە ، بزانە مافی لەسەر تۆ هەیە ، هەروەک تۆ حەز دەکەیت مافی لەسەرت هەبێت ، ئەگەر تۆ لە جێگای ئەو بایت ، ئەویش لە جێگای تۆ با ... تۆ دەزانیت جێگای خالید لە ئیسلام ...... وە دەزانیت پێغەمبەری خوا پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکات ، کردبووی بە فەرمانڕەوا ..... منیش فەرمانڕەوایەتیم دا دەست ، پاشان تەماشام کرد و بیروڕای خۆم گۆڕی ... لەوانەیە ئەمە شتێکی چاک بێت بۆ ئەو لە ئاینەکەی ، کەسیش کەیف خۆش نابێت بە فەرمانڕەوایی ، سەر پشکم کرد لە ئەمیرەکانی موجاهیدان ، تۆی هەلبژارد لەسەر کوڕە مامەکەی ... ئەگەر فەرمانێکت بۆ هات بۆ بیروڕا وەرگرتنی ، لە خواترسی ، ئامۆژگاریکار ، یەکەم کەس کە دەست پێ دەکەیت :. ابو عبیدەی کوڕی جەڕاح و ، موعاذی کوڕی جەبەل و ، خالیدی کوڕی سەعید سێیەمیان بێت ، تۆ ئامۆژگاری و چاکەیەکی زۆر لەمانە دەبینیت ....
ئاگادار بە لەدیکتاتۆریەت لە بیروڕا بەبێ ئەوانە ، یان لێیان بشاریتەوە]
هەروەها لە جەنگی (مرج الصفر) لە خالکی شام ، کاتێک جەنگ لە نێوان مسولمانان و ڕۆم دەستی پێکردبوو ، کەوا زۆر بە ترس و سامناک بوو ، لە پێشەوەی هەمووان کەوا پاداشتیان کەوتە سەر خوای گەورەو ، شەهید بوو ، قۆناغی گەنجایەتی و ولاویەتی بەم کاروانە پیرۆزە بڕی و تاکو کاتی شەهید بوونی لە کاروانی ڕاستگۆو بڕوادارە ئازایەکان مایەوە ...
کاتێک مسولمانان لە شەهیدەکانی جەنگیان دەپێچایەوە ، بینیان خالید هەموو کاتێک هێمن و خۆڕاگرو ، ژیرو بێ دەنگ و ، بەهێز بوو لە نەخشەکێشان ، هەر هەموویان گوتیان :.
(اللهم أرض عن خالد بن سعيد) ....!! پەروەردگارا ، ڕازی بە لە خالیدی کوڕی سەعید ....!!
ئێمەش دەڵێین : پەروەردگار : هێمنی و خۆڕاگری و ژیری و بێ دەنگی و ئەندازیاری و ئازایەتی خالیدی کوڕی سەعیدمان پێ ببەخشە ..!!
هەروەک لە ئەو ڕازی بووی ، لە ئێمەش ڕازی بە ...!!

**اللهم أمين**

٢٨

# مەجزەئەی کوڕی ثوری سەدوسی

ئەو شەهیدەی سەد
بێ باوەڕی بەدەستی خۆی
ڕەوانەی دۆزەخ کرد

﴿ ٢٨ ﴾

# مەجزەئەی کوڕی ثوری سەدوسی

## ئەو شەهیدەی سەد بێ باوەڕی بەدەستی خۆی ڕەوانەی دۆزەخ کرد

بەڵێ ئەوانەن قارەمانانی سەر فرازی لەشکری خودا ، کەوا بەکەیف خۆشی خۆیان دادەوەشێنن لە تۆزو خۆڵی قادسیە چونکە خوای گەورە سەرکەوتنی پێ بەخشین لەم جەنگەدا ........

دڵ خۆش بوون بەشەهیدبوونی برایەکانیان لەو پاداشتەی بۆیان نووسرا ... هەروەها زیاتر نارەزوویان چوو بۆ جەنگێکی تر کەوا هاوشان بوو لەگەڵ قادسیە لە جوانی و گەورەیی‌دا ..... چاوەڕێ بوون خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ عومەری کوڕی خەتاب فەرمانیان پێ بکات بە گەیاندنی کاروانی جیهاد ، بۆ لەریشە کێشانی تەخت و تاجی کیسرا لە ڕەگەوە .....

چاوەڕێ کردنی ئەم کەڵە پیاوە بەرێزانە زۆری نەبرد بۆ ئەم جیهادە پیرۆزە .... بەڵکو لەم ساتانەدا نێردراوی فاروق لەمەدینەی شاری پێغەمبەر ﷺ بەرێ دەکەوێ بۆ کوفەو ، فەرمانی خەلیفەکەی پێیە بۆ موسای ئەشعەری کەوا لەگەڵ لەشکرەکەی بەرێ بکەوێت بۆ گەیشتن بەلەشکری مسولمانان کاتێ لە بەسراوە دەهاتن ، پاشان بەرێ کەون بۆ ئەهواز بۆ بەدواکەوتنی سەر لەشکری فارس (هورموزان) و زاڵ بوون بەسەریدا ، هەروەها ڕزگارکردنی شاری (توستەر) ی مرواروی و دوڕی کیسرای وولاتی فارس ..

لەفەرمانەکەی خەلیفە واهاتبوو کە ئاراستەی أبو موسای کردبوو ، سوار چاکی کۆڵ نەدەر **(مەجزەئەی کوڕی ثەوری سەدوسی)** گەورەی نەوەی بەکر ببات لەگەڵ خۆی ..

ئەبو موسای ئەشعەری گوێڕایەڵی فەرمانی خەلیفەی مسولمانان بوو ، سوپاکەی ئامادە کرد **(مەجزەئەی کوڕی ثەوری سەدوسی)** یش لەگەڵی ڕۆیشت و گەیشتە ئەو سوپایەی کەوا لە بەسرا دەهات ، بەم جۆرە مانەوە شەڕیان کرد لە پێناوی خودا ... تا ئەو کاتە شار لەدوا شاریان ڕزگار دەکردو ، سەربازگەکانی دوژمنیان پاک دەکردەوە (هورموزان) لە پێشیان هەڵدەهات لەم شوێن بۆ ئەو شوێن شەتا گەیشتە شاری (تۆستەر) کەوادەوری ئەم شارەی کردبوو بە پەرژین ...

شاری توستەر کەوا هورموزان پشتی پێ بەستبوو لە جوانترین شارەکانی فارس بوو ، سروشتێکی سەر سوڕهێنەری هەبوو ، بە پەرژینێکی بەهێز پاراستراو بوو .... ئەم شارە شارێکی دێرینی خاوەن شارستانی بوو لە مێژوو ناوی هەبوو ، لەسەر بڵندایی یەک لەسەر شێوەی ئەسپێک دروست کرابوو .... ڕووباری گەورەی دوجەیلی بەناودا دەڕۆیشت ...

لەسەرەوەی شارەکە (شاذروان) دروست کرابوو ، لە ژێرەوەی ئاوی ڕووباری بۆ داهات ، بەهۆی ئەم نەفەقانەی کە لەژێر زەوی بۆی هەلکەندرابوو . . . شاذروان سەروچاوەی ئەو ئاوەیە کەوا حەوزو نافورەی پێ هەلهێنجرابوو ، نافوورەکان لەسەر شێوەی پەیکەری حەیوانات دروست کرابوو ، کەوا ئاوەکە لە دەمی حەیواناتەکان دەهاتنە دەرەوە . .

شاذروانی شاری توستەر یەکێک بوو لەشێوە دروست کراوە سەیرو سەمەرەکانی ئەم کاتە ، کەوا کۆلەگەکانی بە کۆلەگەی ئاسنینی پتەوو ، دیوارەکانی بە بەردی گەورەی مەحکەم دروست کرا بوون . . هەروەها بە قورقوشم کۆلان و ژێر زەمینەکانی داپۆشرابوو . . . .هەروەها دەورەی توستەر گیرابوو بە دیوارێکی بلند ، پاشان دەورەی دیوارەکە بە خەندەقێکی قوڵ دەورە درابوو ، وەبە ئازاترین لە شکری فارسەکان پاسەوانی لەم دیوارە دەکرا . . . . مێژوو نووسەکان دەڵێن بە یەکەم شورەو گەورەترین شورە لەسەر زەوی دەژمێردرا . . . .

موجاهیدەکانی ئیسلام بۆ ماوەی هەژدە مانگ ئابلۆقەی ئەم خەندەقەیان دا بەڵام نەیاندەتوانی بچنە ناویەوە . . . . لەم ماوەیەدا هەشتا جەنگ ڕووی دا لەگەڵ لەشکری فارس . . هەر جەنگێک لەم جەنگانە دەستی پێ دەکرد بە ڕوویەڕوو بوونەوە لە نێوان سوارچاکی‌ی هەردوو لادا ، پاشان دەبووە شەڕێکی ترسناکی توند لە نێوانیاندا . . . .

مەجزەئەی کوڕی ثەوری سەدوسی تووشی زۆر ڕوویەڕوو بوونەوە بۆوە ، کەوا عەقڵ و هۆش لەگەڵی ڕادەوەستا ، تاکو دوژمنانیش لە ئازایەتی ئەم پیاوە سەریان سوڕمابوو . . .

توانی سەد پیاو لەپیاوە ئازا سوارچاکەکانی دوژمنان بکوژێت ، هەتاکو ناوی مەجزەئە ترسی پەیداکردبوو لە ڕیزەکانی فارس و ، جێگای عیززەت وغیرەتیش بوو لەدڵی موسڵمانان . . . . .

لەم کاتانەدا ئەوانەی مەجزەئەیان نەدەناسی بەتەواوی ناسیان و بۆیان دەرکەوت بۆچی ئەمیری مسولمانان سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەم پیاوە دەبێ لە پێشەوەی ئەم لەشکرە موجاهیدە بێت . . .

بەڵام لە کۆتا جەنگ لەم هەشتا جەنگە ،مسولمانان هەڵمەتێکی زۆر ئازایانەیان بردە سەر دوژمنەکانیان و ، فارسەکان ئەوپردە دروست کراوانەی لەسەر خەندەقەکان دایان نابوو لایان بردو ، پەنایان بردەوە بەر شارە مەحکەمەکانیان و دەرگاکانیان لەسەر خۆ داخست . . . . .

مسولمانان لەپاش ئەم ئارام گرتنە درێژە تووشی دۆخێکی خراپتر بوون ، فارسەکان لەسەر بورجە بڵندەکان مسولمانیان تیر باران دەکرد . . . . هەروەها لەسەر شورەکان زنجیرێک بە قولابی ئاگرینی سۆر کراوە کۆتایی هاتبوو . . .ئەگەر هەر موجاهیدێک بیوستبایە لەم شورەیە نزیک ببێتەوە یان خۆی پێ هەلبواسێ ئەم قولابانەی بەلەشی

وەدەنووساو لەشی هەمووی دەسوتاند و دەیکوشت . . . ئەم کارە بووە هۆی بەلایەکی گەورە بۆ سەر مسولمانان ، تاوایان لی هاتبوو بە دلێکی مل کەچ و لە خواترسەوە لە خوا دەپاڕانەوە کەوا ڕزگاریان بکات و سەریان بخات بەسەر دوژمنی خواو دوژمنەکانیان:

کاتێک أبو موسای ئەشعەری تەماشای ئەم شورە مەزنەی توستەری دەکرد ، کە نائومێد ببوو لە گرتنی ، تیرێک لە پێشی کەوتەوە کەوا لەسەر شورەکە بۆی هاتبوو ، تەماشای کرد نامەیەکی لەگەڵە تێیدا نووسرابوو :ـ
من بەڕاستی پروام بە ئێوە هەیە ئەی کۆمەڵی مسولمانان ، من بە ئەمینتان دەزانم لەخۆم و لەماڵم و لەکەس و کارم و ئەوەی بە دوام دەکەوێ ، ئەوەی لەسەرە منە ڕێگاتان پێ نیشان بدەم لە دەروازەیەک لە دەروازەکان بێنە ناو شار . . . .
ئەبو موسا بەم جۆرە ئەمانیدا بە خاوەن تیرەکەو ، تیرەکەی بۆ هاوێشتەوە . . . ئەم پیاوە بڕوای بەئەمانی مسولمانان هات و کاتێ (ڕاستگۆیی بە بەڵێن و وەفایان بە پەیمان) یانی لی بیستبوون ، لەتاریکایی شەودا بە نهێنی خۆی گەیاندە ئەبو موساو ڕاستی ئەم کارەی بۆ ڕوون کردەوەو گووتی :ـ
ئێمە گەورە پیاوانی میللەتەکەمان بووین ، هورموزان برای گەورەی کوشتومەو ، دەستی درێژ کردووە بۆ ماڵ و خێزانی ، هەروەها خراپەشی بەرامبەر من لە دڵی خۆی هەڵگرتووە تاکو وام لی هاتووە لەخۆم و منداڵەکانم ئەمین نەبم . . . .
ئینجا پەنام هێناوە بەر دادوەری وەفای ئێوە بەرامبەر غەدروستەمی ئەم پیاوە ، لەبەر ئەوە بڕیارم دا کەوا ببمە ڕێ پیشاندەرتان بۆ ئەو دەروازە نهێنییەی کە پێی دەچیە ناو شاری (توستەر) .. پیاوێکم بدەرێ خاوەنی ئازایەتی و هۆش بێت ، هەروەها مەلەوانیش بزانێ تاکو ڕێگای پێ نیشان بدەم . . .
ئەبو موسای ئەشعەری داوای لە مەجزەئەی کوڕی ئەوری سەدوسی کردو ، نهێنییەکەی لەلادرکاندو ، پێی گووت :ـ
پیاوێکم بۆ دیاری بکە لەکۆمەڵەکەت خاوەن هۆش و وورەو بە توانا بێت ، مەلەوانی بزانێت . .
مەجزەئە پێی گووت :ـ
ئەم پیاوە با ئەمن بم ئەی ئەمیر . . .
ئەبو موسا پێی گووت :ـ
ئەگەر تۆ حەز دەکەیت ، برۆ بە بەرەکەتی خوای گەورە . . . .
پاشان پێی ڕاگەیاند کەوا ئەم شوێنەی پێی دا دەچێت لە یادی نەچێت و ، شوێنی دەرگاکەش بناسێت .. هەروەها جێگای هورموزانیش دیاری بکات و ، شێوەو ڕوخساری بناسێت و ، لەم کارەش زیاتر هیچ کارێکی تر نەکات . . . . .
لێرەدا مەجزەئەی کوڕی ئەور لەگەڵ چاوساغە فارسیەکە لە تاریکایی شەودا

دەستی بە ڕۆیشتن کرد ، بردیە نەفەقێک لە ژێر زەوی کەوا دەگەیشت بەڕووبارەکەو شارەکە ....

ئەم نەفەقە جارێک فرەوان دەبوو دەیتوانی بەپێی لەناو ئاوەکە بڕوات ، جارێکی تر تەسک دەبۆوە ئنجا بە مەلە ئاوەکەی دەبری ... هەروەها هەندێک جار پەناو پێچی تێدەکەوت و خواردەبۆوە ، جارێکی تر ڕاست دەبۆوە ، بەم جۆرە ڕۆیشت تاکو گەیشتە ئەو دەروازەی کە پێی دەچووە ناو شارەکە ، پکوژی برایەکەی کەوا هورموزان بوو پێی نیشان دا ، وەئەو جێگایەی کە خۆی لێ حەشار دابوو ، کاتێک هورموزانی بینی دەرفەتی وەرگرت ، ویستی تیرێکی بۆ بهاوێژێت و بیکوژێت ، بەلام لێرەدا وەسیەتەکەی ئەبو موسای بەیاد هاتەوە کەوا هیچ شتێک نەکات ، بەم جۆرە ئەم شتەی لە دلی خۆی لابردو ، بەم شوێنەدا گەڕاوە کە کاتی بەیانی پێیدا هاتبووو ....

ئەبو موسای ئەشعەری سێسەد موجاهیدی لە ئازاترین موجاهیدەکان بۆ ئامادە کرد ، کەلەهەموو موجاهیدەکان زیاتر چالاکترو بە ئارامتر بوون و ، توانای مەلەوانی کردنیشیان هەبوو ، ئیتر مەجزەئەی لەسەر کردن بە ئەمیرو ئامۆژگاری کردن و پاشان مالئاوایی لی کردن ... هەروەها ووشەی (الله أكبر) بووە ووشەیەکی نهێنی بۆ بانگ کردنی مسولمانەکان بۆ چوونە ژوورەوەیان بۆ ناو شارەکە .....

مەجزەئە فەرمانی بەپیاوەکانی کرد جل و بەرگی بەریان کەم بکەنەوە ، تاکو توانای ڕۆیشتنیان هەبێت و ، ئاو لەشیان گران نەکات ، وە فەرمانیشی پێدان بێجگە لە شمشێرەکانیان هیچی تر لەگەل خۆیان نەهێنن .... وە ئامۆژگاریشی کردن شمشێرەکانیان لە ژێر جلەکانیان ببەستن ... ئنجا لەسێیەکی کاتی شەو دەستیان بەڕۆیشتن کرد .... **مەجزەئەی کوڕی ثەور** ، موجاهیدە چاونەترسەکانی بۆ ماوەی دوو کاتژمێر ئەم نەفەقە ترسناکەیان بڕی ...

کاتێک گەیشتنە ئەو دەروازەی دەیڕوانیە ناو شارەکە ، مەجزەئە بینی لەم سێ سەد موجاهیدەی کە بردینی بۆ ئەم عەمەلیە ، دوو سەدو بیستیان نەماون ، تەنها هەشتایان ماون ....

هەر لەوکاتەی مەجزەئەو موجاهیدەکانی پێیان نا ناو شاری توستەر ئەوەبوو شمشێرەکانیان دەرهێناو ، پەلاماری پاسەوانانی شورەکەیان داو ، شمشێریان لەسەر سینگیان دانا ....

پاشان هەلمەتیان بردە بەر دەرگاکان و کردیانەوەو تەکبیری (الله أكبر) یان لێدا ... بەم جۆرە تەکبیری ئەوانەی ژوورەوەو ئەوانەی دەرەوە یەکیان گرتەوە ....

مسولمانەکان لەکاتی بەیانی چوونە ناو شارەکە .... لە نێوانیاندا گەورەترین و خوێناوی ترین جەنگ ڕوویدا ، کەوا مێژوو جەنگی وا ترسناک و خوێناوی بە چاوی خۆی نەبینیبوو ..... ئەو کاتەی جەنگ بەردەوام بوو تۆز بەری ئاسمانی گرتبوو ، مەجزەئەی کوڕی ثەور ، هورموزان لە گۆڕەپانەکە دەبینێ و ، پەلاماری دەداو ،

شمشێرێکی بۆ ڕەوانە دەکات ، بەڵام شالاوی جەنگاوەران لێی بزر دەکات
پاشان جارێکی تر دەیبینێ دووبارە پەلاماری دەدات وشەڕی لەگەڵ دەکات .... مەجزەئەو هورموزان بۆ یەکتر دێن و هەر یەکێکیان بە شمشێرەکەی لە ئەوی بەرامبەری دەدات بەلێدانێکی زۆر توندو بەهێز ، بەڵام شمشێری مەجزەئە ئەو نابڕێت و ، شمشێری هورموزان ئەو شەهید دەکات ....
قارەمانی ئازای تێکۆشەری موجاهید لەسەر خاکی جیهاد ڕاکشاو ، بەڵام چاوەکانی دەیزانی خوای گەورە چ سەرکەوتنێکی لەسەر دەستی ئەو بەدیهێناوە .....
موجاهیدە مسولمانەکان بەردەوام دەبن لەشەڕکردن ، تاکو خودای گەورە سەرکەوتنیان بۆ ڕەوانە دەکات و هورموزان دەکەوێتە بەر دەست مسولمانان بەدیلی ... مزگێنی دەرەکان لەشار دەرچوون و ڕۆیشتن بۆ مەدینە بۆ مزگێنی دان بە ئەمیری بڕوادران (فاروق) مزگێنی گرتنی شاری (توستەر) .... هەروەها ( هورموزان) یان لە پێشە خۆیان دەهاژوشت و تاجە گەوهەریەکەشی لەسەر سەری بوو ، شانەکانیشی ڕازابۆوە بە چەند پەڕێکی زێرین بۆ ئەوەی خەلیفە بە چاوی خۆی بیبینێ ....
بەڵام سەد ئاخ و مەخابن مزگێنی دەردەکان پرسەی شەهید بوونی فەرماندەی موجاهیدی خەلیفەیان بە ئیمامی عومەر ، خەلیفەی بڕواداران گەیاند ... ئەویش ئەصحابەی بەرێزی پێغەمبەری خوا ﷺ سوار چاکی تێکۆشەرو کۆڵ نەدەر مەجزەئەی کوڕی ثەوری سەدوسی بوو ....
هەزاران سلاو لە گیانی پاکی ئەم شەهیدەو گشت شەهیدە بەرێزەکانی ئەم ئیسلامە بێت ....

# ﴿٢٩﴾

# سەهلی کوڕی حونەیف

## موجاهیدێکی هەژار

خەڵکانێک وا مەزەندە دەبن کەوا کەمی ژمارە هۆیەکە بۆ بێ هێزی و شکستی بەرامبەر زۆری ژمارە ئەمەش هەڵسەنگاندنێکی هەڵەیە پشت دەبەستێ بەکێشانەیەکی کوێرانەو نەزانانە ، لەبەر ئەوەی تەماشەی لایەنی زۆریەکەی دەکات نەوەکو جۆرەکەی ، یاخود قەبارەکەی نەوەکو ناوەڕۆکەکەی لەگەڵ ئەمانەشدا خوای گەورە دەفەرمووێت :.[قل لايستوي الخبيث والطيب واو أعجبك كثرة الخبيث] ....

بەڕاستی یاوەرەکانی پێغەمبەری پێشەوامان موحەممەد ﷺ سەرکەوتن بەسەر ژمارەیەکی زۆری بێ باوەڕەکان کە پێکهاتبوون لە خراپترین ئادەمیزاد ، لە کاتێکدا ئەوان ژمارەیان بە ڕێژەیەکی زۆر لە ئەوان کەمتر بوو ، لەبەر ئەوەی شوێن کەوتووەکانی ئارامگرو پاک و مەبەستیان سەرخستنی ئایینی خوا بوو ، خوای گەورەش دەستی میهرەبانی خۆی بۆ درێژ کردن و سەرکەوتووی کردن لەکارەکانیاندا وپشتی گرتن : ((إن تنصروا الله ينصركم ويثبت أقدامكم)) ...

خەڵکانێکیش بۆچوونیان وایە کەوا هەژاری ونەبوونی کۆسپێکە بۆ گەیشتن بە پلەو پایە ، ئەم بۆچوونەش نەزانینێکی ترە بە مێژووو ڕاستی یەکانی ، بۆ نموونە ئەم بڕوادارانەی کەوا گەورەی بڕواداران موحەممەد ﷺ سەرکردایەتی کردن ، بۆ ئەوەی هەڵسن بەیەکەم جەنگ لەگەڵ بێ بڕواکان لە جەنگی بەدر ، هەر هەموویان هەژار بوون لەگەڵ ئەوەی ژمارەشیان کەم بوو بەرامبەر دوژمنەکانیان ، هەتاکو پێغەمبەری پێشەوا ﷺ دوعای بۆ دەکردن بەرامبەر خوای پەروەردگار ، دەپاڕایەوەو دەیفەرموو :.[ اللهم إنهم جياع فاطعمهم ، اللهم انهم عراة فاكسهم ، اللهم إنهم حفاة فاحملهم)) ....واتە : پەروەردگارا ئەوانە برسینەو ڕۆزیان بدە ، پەروەردگارا ئەمانە بێ بەرگن و پۆشتەیان کە ، پەروەردگارا ئەمانە پیادەن و سواریان بۆ پەیداکە ....

بەڵام ئەم برسی ورەش و ڕووتانە توانیان بە هۆی گەورەیی پەروەردگاریان و ، هێزی دەروونیان ، مافیان بسێنن و تەرازووی دادوەری بسەپێنن لەسەر زەویداو ، زۆرداران و لووت بەرزان ببەن بە ناخی زەوی داو ، دیوارە درێژو پانەکانی ستەم تێک وپێک بدەن و ئاڵای هەق و دادوەری بەرز بکەنەوە :.

((ويحق الله الحق بكلماته ، ولو كره المجرمون))

ئەم یاوەرە هەژارەش یەکێکە لەدەرچووانی قوتابخانەی موحەممەدی پێشەوا ﷺ .... هەژارێک ژیا بەسەر بەرزی و ، جیهادی کرد بە سەرفرازی و ، بەڕاستی وبە وەفایی گەیشت بە پەروەردگاری بەبێ ئەوەی تۆلە ڕێگا چنگی پێ هەڵبچنێت :. یاوەری هەژاری و ئارامگرو موجاهید و تێکۆشەرو پێشەنگ ، باوکی ثابت (سەهل کوڕی حونەیفی

کوڕی واهبی ئەنصاری) خوا لی‌ی ڕازی بێت ، سەهل پیاوێکی نەبوون و هەژار وبێ دەرامەت بوو ، نەیدەتوانی پێویستی‌یەکانی ژیانی بەدەست بهێنێ و ، لەبەر ئەوە دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک ماڵە غەنیمەکانی جولەکەی (بني النضير) ی بۆ هات (بەبێ شەڕو شۆڕ) دابەشی کرد لە نێوان هەژارە موهاجیرەکان نەوەکوو دەوڵەمەندە ئەنصاریەکان ، بۆئەوەی ئاستی ماددی موهاجیرە هەژارەکان بگات بە برا ئەنصاریەکانیان پێغەمبەری خوا ﷺ دای بەموهاجیرەکان و نەیدا بە هیچ لە ئەنصاریەکان ، بەڵام دوو کەسی لە ئەنصاریەکان بەگەڵ موهاجیرەکان دا ئەوانەش (سەهلی کوڕی حونەیف و أبو دجانە) بوولەبەر هەژاری و پێویستی‌یەکی یەکجار زۆریان.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم هەژاری‌یە پێغەمبەری خوای قەدەغە نەکرد لەبە برا کردنی (سەهلی کوڕی حونەیف و عەلی کوڕی أبو تالیب) ، ئەم یەکتر بەبرا کردنەش نیشانەی گەورەیی پلەو پایەی سەهل بوو لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەم گەورەیی‌یە پێغەمبەر کوڕەمام و ، خۆشەویستەکەی ، زاواکەی عەلی کوڕی أبو تالبی هەڵبژارد بۆ ئەوەی بیکات بە برای سەهلی کوڕی حونەیف . . . . !!

لە لایەکی‌ترەوە پێغەمبەری خوا برایەتی خستە نێوان سەهل و عبداللەی کوڕی مەسعود ئەمەش گەورەیی‌یەکی ترە بەخشرا بەموجاهیدی هەژار (سەهل کوڕی حونەیف) ، عبداللەی کوڕی مەسعود شەشەمینی ئەو یاوەرانەیە کەوا یەکەم جار هاتنە ناو ئیسلام و ، خاوەنی دوو کۆچی مەزنەو ، هەر ئەوبوو گەیشتە سەر گیانی فیرعەونی ئەم زەمانە (أبو جهل) لە جەنگی بەدرو ، یەکێکە لە خاوەن بەیعە پیرۆزەکان (بەیعەی رضوان) ، موجاهیدی ئامادە بۆ جیهاد و پێغەمبەری خوا شایەدی بەهەشتی بۆدا . . . .

مرۆڤیش لەسەر ئایینی هاورێ یەکەیەتی ، بەم جۆرە موجاهیدی مەزن (سەهل کوڕی حونەیف) هەموو جەنگ و دیمانەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بینی ، لەسەرەوەی هەموویان جەنگی بەدر ، لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ چەسپا لە ڕۆژانە توونـد و بەترسەکاندا ، لەڕۆژی ئوحد بەیعەی دا لەسەر مردن ، تیری بۆ دوژمنان دەهاوێشت لە خزمەت پێغەمبەری خوا ، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو :- [ أنبلوا سهلا" ، فإنه سهل ] .

واتە [ تیرەکان بدەن بەسەهل ، بە ئاسانی ڕەوانەی دوژمنانی دەکات ] . . . . .

سەهل لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ مایەوە تاکو ڕزگاری بوو وشەڕ کۆتایی پی‌هات ، هەروەها هەندێک لە یاوەری تریشی لەگەڵ دابوو ئەم سەرفرازی‌یە ئەوانیشی گرتەوە ، بە بەیعەکی ڕاست بەوەفایانە بەیعەی پێغەمبەری خوایان داو ، جیهادێکی قارەمانانە و سەربەرزانەیان کرد . . . .

هەروەک لە لێکدانەوەی (أبن أبي الحديد)ی (نهج البلاغة) هاتووە ، دەربارەی ئەو یاوەرانەی بەرگریان کردووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی ئوحد هەروەک دەڵێت : (لەم

کاتەدا ئەو کەسانەی زۆر بەرگریان لەپێغەمبەری خوا کرد ، عەلی سەلامی خوای لێ بێت ، أبو دجانە و سەهلی کوڕی حونەیف بوون ، هەروەها هزشی بەرگری لەهوی دەکرد . . .

پێغەمبەری دەستپاک ﷺ لەجەنگی ئوحد گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە پاش ئەوەی چەند برینێکی لەلەشی کەوتبوو ، هەروەها کوڕەمام وزاوا و قوتابیەکەی (عەلی) لەگەڵدابوو ، هەر یەکێکیان شمشێرێکی بەخوێن سوورکراوی لەدەست دابوو ، کاتێک گەیشتە ماڵەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پیرۆزی بە شمشێرەوە درێژ کرد بۆ کچە پاکەکەی (فاطمة) (خوا لی‌ی ڕازی بێت) پی‌ی فەرموو :

[ ئەی کچم ئەمە لەم خوێنە پاک کەوە ، سوێند بەخوا ئەمڕۆکە ئەمە ڕاستی کردووە لەگەڵم ] . . . . .

پاشان (عەلی) شمشێرەکەی دا دەست فاطمة و بە فاطمةی گووت :

[ ئەم شمشێرەش پاک بکەوە ، سوێند بەخوا ئەمڕۆکە ئەمە ڕاستی کردووە لەگەڵم ] . .

پێغەمبەر ﷺ بەعەلی گووت [ ئەگەر تۆ بەڕاستی شەڕت کردووە ، سەهلی کوڕی حونەیف و أبو دجانە لەگەڵ تۆ بەڕاستی شەڕیان کردووە ] بەم جۆرە پێغەمبەر بە ویژدانەوە باسی ئەم دوو قارەمانەمان بۆ دەکات کەوا جیهادیان کردووە لەگەڵ عەلی ، ئاماژەیان بۆ دەکات و بەچاکە ناویان دەهێنێ . . .

لەگەڵ ئەم دوو قارەمانە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دوو قارەمانی تریشمان بۆ دەکات کەوا لەگەڵ ئیمامی عەلی ئازایەتیان نوواندووە ، پاش گەڕانەوەی لە جەنگ بە کوڕە مامەکەی ئیمامی عەلی دەفەرمووێت :-[ ئەگەر تۆ شەڕێکی چاکت کردووە ، عاصمی کوڕی ثابت کوڕی أبی الأفلح و ، حارث کوڕی صمەو ، سوهەیلی کوڕی حونەیف و ، أبو دجانەش لەگەڵ تۆ شەڕێکی باشیان کردووە ] .

هەروەک بڵێیت خوای گەورە نیگای بۆ پێغەمبەر ڕەوانە کردبێ چەند جاران باسی قارەمانیەتی سەهلی کوڕی حونەیف دەکات ، ئەمەش هێمایەکی شاردراوە بوو کەوا بینرا سەهلی کوڕی حونەیف پاش کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەری خوا هەموو کات بەردەوام بوو لەسەر جیهاد کردن ، جیهادەکانی زیاتر تیشکی دایەوە لەتەک ئیمامی عەلی لە کاتێکدا بەرەنگاری ئەم هەموو جەنگە توند و دژوارە یەک لە دوای یەکانە بوونەوە ، سەهلی کوڕی حونەیف لە ڕیزی ئیمام بوو ، یارمەتی دەداو بەرگری لی‌ دەکرد ، تاکو کۆتایی ژیانی بەدڵسۆزی لەگەڵی مایەوە . . . . . لەکاتێکدا ئیمام عەلی دەیویست ڕێگای شام ببڕێت بۆ بەرەنگار بوونەوەی ناهەق و خاوەنەکانیان ، موهاجیرەکان و ئەنصارەکان لەدەورەی کۆببوونەوە ، پاش حەمدو ستایشی خوای گەورە پی‌ی گووتن :- [ ئێوە باشترین بۆ چوونتان هەیە ، سەروچاوەی هەموو دانایی یەکن ، کردەوەی پیرۆز دەکەن ، زمانتان لە هەق ڕاهاتووە ، بەڕاستی بڕیارمان دا بە دوای دوژمنی ئێوەو ئێمەدا بچین ، ئێوە بیروڕای خۆتان دەربڕن] . . .

یەکێک لەوانەی قسەی کرد ... سەهلی کوڕی حونەیف بوو ، پاش حەمدو ستایشی خوا گووتی :[ ئەی ئەمیری بڕواداران ، ئێمە ئاشتی یمان لەگەڵ ئەو کەسەیە کە تۆ ئاشتی لەگەڵ دەکەیت وشەڕمان لەگەڵ ئەو کەسەیە کە تۆ شەڕی لەگەڵ دەکەیت ، بیروڕامان بیروڕای تۆیە ، سوێندمان سوێندی تۆیە ، بیروڕامان ئەوەیە بچینە لای خەڵکی کوفە ، فەرمانیان پێ بدەی بە ئامادەبوون و ، ئەوەیان بۆ باس بکەیت کەوا جیهاد چ پلەوپایەیەکی هەیە ، ئەوانە خەڵکی ئەم شارەن و ، خەڵکەکەی ئەمانەن ، ئەگەر ئەوانە ڕاست بکەن ئەوا ئەو شتەی تۆ دەتەوێت و داوای دەکەی بۆت ڕاستە ڕێ دەبێت ، هەرچی ئێمەین هیچ گرفتێکمان (خلاف) لەگەڵ تۆ نییە ، هەر کاتێک فەرمانمان پێ بکەیت گوێ ڕایەڵیت دەکەین ] ...

لەم ووشانەی (سەهل) چەند ڕاستیەکمان بۆ دەردەکەوێت : یەکەمینیان ئیمام عەلی خۆش دەوێت .. دووەمینیان هەموو کات ئامادەیە بۆ جیهاد ، سێیەمینیان ڕاستگۆو دلسۆزە بۆ ڕاوێژەکانی ئیمام .. ئەمەیە سەهلی کوڕی حونەیف لە ڕۆژی (صفین) بانگی خەڵک دەکات بۆ جیهادێکی ڕاست و بەرگری کردنی ترس ، کەدەڵێت : [ئەی خەڵکینە ، بیروباوەرتان یەک لاکەنەوە ، سوێند بە خوا ئێمە شمشێرمان لەسەر شانی خۆمان دانەناوە بۆ کارێک سەرمان لێ بشێوێنێت ، ئەوا ئەم کارە لەپێشمان ئاسان بووەو بەکارەکەمان زانییوە ] ..

ڕۆژ بەڕۆژ خۆشەویستی سەهل بۆ ئیمام عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) زیاتر دەبوو ، کاتێک ئیمام ڕۆیشت بۆ عێراق بڕوایی بە سەهل کردو لەدوای خۆی لەسەر مەدینەی بەجێهێشت ، پاشان گەڕایەوە بە دلسۆزی خۆی داناو ، پشتی پێ بەست لە ڕاوێژو بیروڕاکانی کاتێک سەهل کرا بە فەرمانڕەوای ئیمام عەلی لەسەر مەدینە ، هەندێک کەس پشتیان تێ کردو دایەنە پاڵ معاویە کەوا تاکۆکی ئیمام عەلی بووو ، سەهل نووسراوێکی بۆ ئیمام ڕەوانە کرد و گووتی

[ وام پێ گەیشتووە هەندێک کەس پاش ئەوەی لەگەڵ تۆ بوون دزە دەکەن بۆ لای معاویە ، خەم مەخۆ لەم ژمارەیەی لە دەستت چوو ، لە هێزت کەم بۆوەو ، ئەم گوناهە بۆ ئەوان بەسە ، بەمە دڵی خۆت بدەوە ، ڕاکردنی ئەوانە لە ڕاستی وهەقە ، بارو بارگەیان بۆ کوێری و نەزانی تێک ناوە ، ئەوانە پیاوی دونیان و پێی ڕازین و ، بەخێرایی بۆی دەچن ، پاش ئەوەی هەقیان بینیوەو ناسیوەو ، گوێیان لێی بووەو پێی ووشیار بوونەوە ، دەیانزانی ئەو خەڵکەی لە گەڵ ئێمەیە باشترین سەرمەشقی هەقن ،ئەمانە ڕایان کردووە بۆ ئەو شتەی شەیتان بۆی ڕازاندینەوە ، ئەمانە بالێمان دوور بکەونەوەو ڕیسوا بن . سوێند بەخوا ئەمانە لە ناهەق و ڕایان نەکردووەو ، گەیشتبن بە دادوەری ، ئێمە لەم کارە چاومان لەمەیە خوای گەورە کارەکانمان بۆ مل کەچ بکات و ، لەسەرمان ئاسان بکات ، ئەگەر خۆی حەزی لێ بکات ..

والسلام عليكم ورحمة الله ] ....

لەم نامەیەشدا چەند ڕستەیەک دەردەکەوێت : کەوا سەهلی کوڕی حونەیف دەڵێ [illegible]
دەبێت لە کاتێکدا مسولمانان پەرتەوازەییان لەناو دروست دەبێت ، ئایا [illegible]
کەس خۆشەویستی دونیا دەهاوێتە پێش هەق و فەرمانەکانی خوا ، ئەمەش بەڵگەیە بۆ
ئەوەی سەهل ڕێگای جیهاد و تێکۆشانی گرتووە لەگەڵ ئیمامی عەلی دوور لە
مەبەستی ماڵ و سامان و خۆشی دونیا ، هەروەها بۆشمان دەردەکەوێت ئیمامی عەلی
(خوالێی ڕازی بێت) زۆر ڕێزی ناوە لەم موجاهیدە هەژارە سوهەیلی کوڕی حونەیف

ئەگەر سەهلی کوڕی حونەیف بە تەواوی تێکۆشاوەو لە جیهاد بەردەوام بوو ، لایەنی شارەزا بوون لە ئایینەکەی لەیاد نەکردووەو ، فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لەیاوەرەکان وەرگرتووە ، یاوەرەکانیش لەویان وەرگرتووە ، هەروەک (نووی) باس دەکات کەوا سەهل چل فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەت کردووە ، هەروەها سەهل کوڕێکی هەبووە ناوی (باوکی أمیە أسعد کوڕی سەهل کوڕی حونەیف) بووە ، فەرموودەی پێغەمبەری لە باوکی وەرگرتووەو گێڕایتیەوە ، هەروەک باوکیشی یاوەری بەڕێزی پێغەمبەر بووە ، نەوەکانی سەهل لە مەدینە مانەوە ، بەڵام خۆی لە کوفە جێنشین بوو

سەهل برایەکی هەبوو ناوی (عوسمانی کوڕی حونەیف) بوو ، ئەویش یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا بوو ، بەشداری جەنگی ئوحدی کردووەو ، ئیمامی عەلی بەکاری هێناوە لەسەر بەسرا ، بەڵام (تەلحە و زوبەیر) بە سەری سەرکەوتن و عوسمانی کوڕی حونەیف لە خەلافەتی معاویە کۆچی دوایی کرد ..

سەهلی کوڕی حونەیف لەساڵی (سی و هەشتی کۆچی) کۆچی دوایی کرد ، (ئیمامی عەلی کوڕی أبی تالیب) نوێژی لەسەر کردو ، هەروەک دەگێڕنەوە شەش جاری (تکبیر) ی لەسەر لێدا ، لەگەڵ ئەوەی کەوا نوێژی مردوو چوار (تکبیر) ی بۆ دەگووترێ ، کاتێک لە ئیمامیان پرسی دەربارەی ئەم دوو (تکبیر) ە زیادەی کۆتایی ، وا پاساوی بۆ هێنایەوە کەوا سەهلی کوڕی حونەیف بەشداری جەنگی بەدری کردووە ، کەواتە ئەم پیاوە لە بەدریەکانە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرموویەتی :

لەوانە خوای گەورە بەموجاهیدانی جەنگی بەدری فەرمووە :[ چی حەزی لی دەکەن بیکەن من لێتان خۆش بووم]

هەروەک بلێیت لێرەدا ئیمام ئیجتیهادی کردووەو ئەم دوو (تکبیر) ەی زیاد گووتووە بە نیازی زیاتر ڕێز لێنان لە سەهل لە هەموو ئەوانی تر (خوا لێیان ڕازی بێت) . . .

ئیتر خوای گەورە کەمی ژمارەی نەکردۆتە هۆیەک بۆ ژێر کەوتن ، ئایا ئەمە چۆن ڕوودەدات ئەگەر ژمارەیان زۆر بێت !!؟ هەروەها هەژاریش نەبووە هۆیەک بۆ ژێر کەوتنی مسولمانانی پێشوو ، ئایا ئەمە چۆن ڕوودەدات ئەگەر دەولەمەندبن !!؟

بەلێ ئەم بەندانەی پێشووی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر شتێکیان ویست لە

خوا بۆیان کرا ، لەبەرئەوەی ئەمەی خوا ویستی کردیان ، لەبەر ئەوەی دەروونی خۆیان تەسلیم بەخوا کرد ، بۆ ئاییینی خوا دلسۆزی بوون ، خۆیان قوربانی ڕێگای خوا کرد ، هەر شتێک خوا فەرمانی پێ کردن کردیان ، ئەوەی قەدەغەی لێکردوون نەیانکرد ، ویستیان لەگەڵ ویستی خوا بوو ، بیرو بۆچوونیان مل کەچی خوای گەورە بوو ، ئینجا وایان لی هات ئەوەی ویستیان خوای گەورە بۆی کردوون ... خوای گەورەی لە هەموویان ڕازی بێت .

٣٠

# عورِوەی کوڕی مەسعودی سەقەفی

شەهیدی کۆچ کردوو

(المهاجر الشهيد)

## ﴿٣٠﴾

# عوڕوەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی
# شەهیدی کۆچ کردوو (المهاجر الشهيد)

جێگای سەر سووڕمان نی‌یە ئەوەی ئیمان بە ئادەمیزادی دەکات ، ئیمان دڵە ڕەقەکان نەرم دەکاتەوەو ، ڕووخاوەکان زنیدوو دەکاتەوەو ، پاڵیان پێوە دەنێ بۆ کاری چاک و خواپەرستی.. . .ئادەمیزاد لە ناو تاریکایی نەزانی دەمێنێتەوە ، لەگەڵ گوفتارە گومڕاییەکانی و ،کردەوە خراپەکانی تاکو خودای گەورە ڕێگای خۆی بۆ ئاسان دەکاو ، هیدایەتی دەدات بۆ ڕێگای ڕاست ، ئنجا هەنگاو بەرەو پێش دەبات بەبێ ترس و بەبێ گومان ، وە ئەگەر قەدەری بەختەوەر چارەنووسی بۆ دیاری کردبێ لەجێگای خۆی کەوا لەچینی سەرکەوتووەکانە لەدونیاو ،لە چینی سەرکەوتووانە لە ڕۆژی دوایی ، ئەمەش بەخششێکی خوای گەورەیە دەیدا بەوەی حەزی لی‌دەکات ، بەڕاستی خوا خاوەن گەورەیی‌یەکی مەزنە.....

لە هەندێک یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ بینمان هەندێک یاوەر بڕوا هێنانەکەی بەدوا دەکەوت ،پاشان بەئاگادەهاتەوە ، دەچووە ناو چینی بڕواداری دڵسۆزەکان ،کاری موجاهیدە ڕاستگۆیەکانی دەکرد ، خوای گەورەش تەوبەی لی وەردەگرت ،بەتەوبەکی یەکجارەکی و پاشگەز بوونەوەکەی بەتەواوی لی وەردەگیرا ، پاشان دەبوو بەیەکێک لەسەرکەوتووان ....

یەکێک لەمانە : یاوەری بەڕێز باوکی مسعود (عوڕوەی کوڕی مەسعودی کوڕی معتەبی ثەقەفی) خوا لی‌ی ڕازی‌بێت ، کەوا لەپێش ئیسلامدا جێگایەکی دیاری هەبوو لە نێو قورەیشدا ،پاش ئەوەی مەککەی بەجێهێشت ، هەتا وا ڕیوایەت دەکەن کەوا مەبەستی لەم ئایەتەی خوا [وقالوا لو لانزل هذا القرآن على رجل من القريتين عظيم ] ..الزخرف/٣١ ، دەربارەی عوڕوە هاتۆتە خوارەوە.

عوڕوە پیاوێکی دەوڵەمەندو هەبوون بوو ،لەکاتی تەنگانەو لی‌قەوماودا ماڵی خۆی دەبەخشی ،تاکو باری سێزدە کەسی لە خوێنی میللەتەکەی دەهاوێشتە سەر ئەستۆی خۆی ،بەڵام هەر هاوبەش پەیداکەرماوە (لەبەر حیکمەتێک خوا بەخۆی دەیزانی )تاکو گەمارۆی تائیف لە ساڵی هەشتەمی کۆچی ، هەروەها یەکێک بوو لە نوێنەرەکانی کاروان بۆ گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕێککەوتنی (حودەیبیە) ، نیشانەی پێغەمبەرایەتی لە گەورەی ئادەمیزاد بینی و سەری سوڕماودلی جۆش درا بۆ بیرکردنەوە لە ئیسلام ...

عوڕوە گەڕاوە لای میللەتەکەی کاتێک لەخزمەتی پێغەمبەری خوا بوو ﷺ پی‌ی گووتن : [ چوومە لای کیسرا کاتێک پادشابوو ، قەیسەر لەکاتی پادشایەتی و ،

نەجاشی لەکاتی پادشایەتی ،سوێند بەخوا هیچ پادشایەکم نەبینی لەناو میللەتەکەی،
وەک موحەممەد ﷺ لەناو یاوەرەکانی ، من میللەتێکم بینی بۆ هیچ شتێک پەسوا ی
ناکەن ، بیروباوەڕی خۆتان بدەن ،ئەم پیاوە ڕێگای ڕاستی بەئێوە نیشان داوە ،ئەوەی
پێشنیاری ئێوەی کردووە لیی وەرگرن ،من ئامۆژگاری ئێوە دەکەم ،لەگەڵ ئەمەشدا
دەترسم لە ئێوە ئەگەر پشتیوانی نەکەن ]

کاتێک ئامۆژگاریەکەیان وەرنەگرت ، بەتوورەییەوە پیێ گووتن : [ واتێتان ڕادەبێنم
تووشی خراپیەک بێن] . . !!! ئنجا بە خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون ڕۆیشتن لە تائیف .

لە مانگی ڕەمەزانی سالی نۆی کۆچی کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ وازی هێنا لەگەمارۆی تائیف گەڕاوە بۆ مەدینە تووشی بە تووشی (عوروە)بوو ، پیێ گەیشت پێش ئەوەی بگاتە ناو شاری مەدینە ، بڕیاری مسولمان بوونی دا بەنیازێکی ڕاست و ،دلسۆزیەکی تەواو ،لەوانەبوو پێش ئەم کاتە ببێت بەمسولمان ، بەلام لەمە ترسا پیێ بلێن بووە بەموسلمان لەترسی ئابلوقە . . .

ئەم ئیمانە دروست کراوێکی نوێی بەخشی بە (عوروە) ، چونکە هیچ ڕێگایەکی نەناسی بێجگە لە ڕێگای خوای گەورە نەبێت ، لەسەری سوور بوو ، بانگەشەی بۆ کرد ، لەڕێگایدا گوێی بەهیچ شتێک نەدا ، پێشنیاری پێغەمبەری خوا کرد ﷺ ڕێگای بدات بە گەڕانەوەی بۆ تائیف ، بۆ ئەوەی مزگێنی ئیسلام بدا بە کەسوکارەکانی ـ هۆزی ثەقیف کەوا تاکو ئیستا لە سەر هاوەڵ پەیداکردنن. . .

پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری کردەوەو ،پیێ گووت : [ اخاف ان يقتلوك ] دەترسم لەمەی بتکوژن . . . ، عوروە وەلامی دایەوە بەمەی کەوا جێگایەکی بەرزی هەیە لە نێو میللەتەکەی . . لە ناویانداهەیە خۆشیان دەوێ وبۆی مل کەچن گووتی :ئەی پێغەمبەری خوا ،منیان خۆشتر دەوێت لە چاوەکانیان ، ئەگەر بمبینن خەوتوومە بەئاگام ناهێنن . .

پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی نەکرد بەرامبەر ئەم شانازی و سووربوونە ، قەدەغەی بکات لەشەرەفی بانگهێشتن بۆ خوای گەورە ، ڕێگای پێداو ، (عوروە)گەڕاوە تائیف ، هەروەها لەنەریتی هاوەڵ پەیداکەرەکان وابوو هەریەکێکیان لەشار چووبایە دەرەوە ، پاشان گەڕابایەوە ، لەسەرەتادا دەستیان دەکرد بەسەردانی بتەکەیان کە ناوی (اللات) بوو ، پێشیان دەگووت (الربه) . . . .

بەلام عوروە کاتێک گەڕاوە ئەم کارەی نەکرد ،بەلکو یەکسەر ڕووی لەمالەوە کرد ،چۆن ئەم کارە بکات ، ئیسلام پەردەی خەیالّ وبیروباوەڕە پڕو پووچەکانی لە سینگی لاداوە ، هەروەها لە مالی (عوروە) شوێنێکی بلند هەبوو ، چووە سەری و ، لەسەری جێگایەک هەبوو وەکو میحراب ، کاتێک بەیانی هەلات لە ڕۆژی یەکەم لە نێو میللەتەکەی پاش مسولمان بوونی ، دەنگی بلند کرد لەگەڵ هاتنی بەیانی بەدەنگی تەکبیری بانگ دان بۆ نوێژ . . .

لـه پرێکدا میللەتەکەی گوێیان لەمـەبوو ، فریـای عـوروە کـەوتن بـۆ زانینـی ئـەم هەواڵـە ، عـوروە هـەواڵی ئیسـلام بوونـی خـۆی دەدات پـێیان بـەبێ ئـەوەی بترسـێ یـان بشڵەژێ ، بـەڵکو بـە ئـەوەندەش واز نـاهێنێت ، ئیسـلامیان ناڕاسـتە دەکـاو ، بانگیـان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست .

ئەم کارەی عوروە بانگەشەی بۆ دەکرد لـەسەر گاورەکان زۆر گـران و گـەورەبوو ، بـەڵام عوروە سووربوو لـەسەر ئەم نەخشەیەو بەردەوام بوو لـەسەر ڕێگای خـواو ، بانگەشـەی بۆ دەکـات لـە نێـوان گـاورە داخ لەدڵـەکان ، کـەوا تـاکو ئێسـتا خـوای گـەورە ڕێگـای پـێ نەدابوون هیدایەت بدرێن .

عـوروە نەترسـا لـەمـەی کەسـێکی بەتەنهایـە ، ژمارەیـەکی زۆر لـە دوژمنـەکانی بیروبـاوەڕی دەورەیـان داوە ، ئەوانـەی لـەم کاتـەدا نـازانن نـەرمی و ڕێگـا پێدان مانـای چی‌یە ؟! ، بەڵام عوروە تەنها لـە خوا دەترسێ و لـەسەر ڕێگاکەی بەردەوام مزگێنـی دەداو دەترسێنێ و ئاگادار دەکاتەوەو ، بەندایـەتی بـۆ بتـەکان و پەرستنیان بـەکارێکی پڕوپـوچ دادەنێ ، ئەوانیش هیچ چارەیەکیان نەما بێجگە لە دەورەدان و پالـەپەستۆ خستنەسـەری بۆ ئەوەی ڕزگاربن لەدەستی . . .

هەڵوێستـێکی سـەیرو سـەمەرە هاتـە پێشـەوە ، نموونـەی یـاخی بـوون و بوختـان بـوو لەلایـەن گاورەکـان ، هـەروەها نموونـەی وەفـاداری و بـەرخودان بـوو لەلایـەن پاڵـەوانی تێکۆشەر عوروەی کوڕی مەسعود . . . .

گاورەکان ڕوویان کردە عوروەو ، پەلاماریان دا بەهاوێشتنی تیر لە هـەموو لایـەک ، ئەویش بەردەوام بوو لـەسەر ڕێگاکەی و بانگ کردنی خەڵـک بۆ سەر ئیسـلام ، ئـەوەندەی لە تواناشی هـەبوو بـەرگری لـە خۆی دەکرد و ، ژیان و مردنـی لـەلا یەکسـان بـوو ئەگـەر ماوەو ژیا ئەوا دەمێنێ بۆ تێکۆشـان و جـەنگ کـردن لـە ڕێگـای خـوا ، وەئەگـەر مردیـش ئەوا ئەم مردنە لە ڕێگای بیرو باوەڕو ڕێبـازە . . . تـیرێک لـە تیرەکـان بـۆ عـوروە هـات ، پێی کەوت و بە خوێن لەشی سووربوو کەوتـە سەر زەوی . . . . کـاتێک عـوروە لـە نێـوان ژیان و مردن بوو ، دوا هەناسەی دەهات و دەچوو ، هەندێک لـە کەسوکاری هاتنە لای و پرسیاریان لـی کرد ، چی دەڵێیت دەربارەی خوێنت ؟! .

ئەویش لەگەڵ بێ هێزی و بـێ توانـایی قسـەکردن وەلامـی دانـەوەو فـەرمووی : ئـەوە ڕێزێکە خوای گـەورە پـێی ڕێـزی لـی‌نـاوم ، ئەمـە شـەهادەتێکە خـوا پـێی بەخشـیووم ، تەنها ئەوەم هەیە لەگەڵ ئەم شەهیدانەی کەوا لـەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ شـەهید کـران پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ تائیف ، لەگەڵ ئەم شەهیدانە بە خاکم بسپێرن .

بەم جۆرە عوروە دوا هەناسەی دا گیانی پاکی بەرزبۆوە ، ئەمەش لە ساڵی نۆی کۆچی بوو ، ئامۆژگاری و وەسیەتەکانی موجاهیدی شەهید هاتە جێ و ، لە دەرەوەی تائیف لـە نێو شەهیدە سەربەرزەکان ، کەوا لـەگەڵ پێغەمبەری خوا بوون ﷺ شـەهید بـون بـە خـاک سپاردرا . . . .

کاتێک هەواڵی شەهید بوونی گەیشتە عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) بە چەند دێرە هۆنراوەیەک پرسەنامەی بۆ کرد ، لەگەڵ ئەوەی ئیمامی عومەر زۆر بەکەمی هۆنراوەی دەگووت ، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەوا فاروقی بەڕێز زۆر خەفەتی خواردووە بەشەهید بوونی عوروەی کوڕی مەسعود .

لەسەرەوەی ئەمانەش ڕێزلێنانی پێغەمبەری مەزن ﷺ هات بۆ عوروەی شەهید ، لە (صحيح) ی مسلم و ئیتر هاتووە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت :-[ ورأيت عيسى بن مريم ، فأذا أقرب من رأيت شبها" به عرروه بن مسعود ] .

واتە : عیسای کوڕی مەریەمم بینی ، نزیکترین کەس لە شێوەدا بەئەو دەچوو ، عوروەی کوڕی مەسعود بوو..

هەروەک دەڵێن: خواش بەڕاستی ئەمە دەزانێ. پێغەمبەری خوا ﷺ پاش شەهید بوونی عوروە فەرمووی : [ مثله في قومه ، كصاحب يس ] .. واتە _ نموونەی ئەو لەناو میللەتەکەی وەکو ڕووداوەکەی سورەتی یاسینە هەروەک خوا دەفەرموویت :-

(وجاء من أقصى المدينة رجل يسعى قال يا قوم أتبعوا المرسلين ، أتبعوا من لايسألكم أجرا" وهم مهتدون ، ومالي لاأعبد الذي فطرني واليه ترجعون ، ألتخذ من دونه آلهة" إن يردن الرحمن بضر لاتغنى عنى شفاعتهم شيئا" ولا ينقذون ، أني إذا لفي ضلال مبين ، إني آمنت بربكم فاسمعون ، قيل أدخل الجنة قال يا ليت قومي يعلمون ، بما غفرلي ربي وجعلني من المكرمين)

خوا حەزی کرد بە حەزکردنێکی سەر سوڕهێنەر ، (ثقيف) بێنە لای و هەموویان مل کەچ یەکی تەواویان هەبێ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پاش شەهید بوونی عوروە بەماوەیەکی کەم ، ئیسلام بوونی خۆیان بە هەڵبژاردن و ئارەزووی خۆیان ئاشکرا کرد ، پەیمانیان دا بە پێغەمبەر لەسەر ئیمان ...

(لات) و بتەکانی تر گۆڕ بە گۆڕ کران و ڕوخێنران ، ووشەی خوا لەسەر هەمووان بەرز بۆوە ، هەروەکو بڵێیت شەهید بوونی عوروە بووە نرخ و کلیلی ئیمانی هۆزی (ثقيف) ، خوای ئێمەش ئەوەی حەزی لێ بکات دەیکاو هەڵیدەبژێرێت ....

گاوڕەکان لەلای (لات) ماڵ و خشڵیان دادەنا ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد ، لەم ماڵە بدەن بە باوکی مولەیەحی کوڕی عوروەی کوڕی مەسعود ، بۆ ئەوەی قەرزی باوکی عوروەی پێ بداتەوە ، ئەم هەڵس و کەوتەی پێغەمبەری ﷺ داینا جۆرێک بوو لە ڕێزلێنان لە منالانی شەهیدان ....

ڕەزای خوا لە شەهیدی موهاجیری کۆچ کردوو : عوروەی کوڕی مەسعودی ثەقەفی

٣١

# نەعمانی کوڕی موقەڕین

شەهیدی نەهاوەند

﴿٣١﴾

# نەعمانی کوڕی موقەڕین

## شەهیدی نەهاوەند

گومانی تیانیە بەرزترین ، تڕۆیکی بەرخودان ، کەوا ڕێزی لی بگیریّ و ، جێگای شانازی و خێرو بەرەکەت بیّ ، ئەوەیە سەر لەشکری موجاهیدان لە هەموو موجاهیدان سوورتر بێت بۆ بەخشینی گیانی ، بۆ ئەوەی ئەوانەی لە دوای ئەو دەجەنگن زیاتر بڕواییان بە مەسەلەکە هەبیّ و بەبیّ هیچ گومانێک لە دڵیان بچن بۆ مەیدانی جەنگ و سستی لی نەکەن .....

مێژووی زێڕینی ئیسلام زۆر لەم نموونە ئاسایانەمان بۆ دەهێنێتەوە لەم پێشەوایانە کەوا ببن بە پێشەنگێکی چاک بۆ موجاهیدەکانیان سەبارەت بە ڕاستگۆییان لە جیهاد و وانەی شەهیدی ....

یەکێک لەو صەحابیە موجاهیدانە قارەمانی شەهید : نەعمانی کوڕی موقەڕین کوڕی عائذی مەزنی ، کەوا خۆی و حەفت برای هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها چوار سەد سوارچاکی هۆزی (موزەینە) ی لەگەڵ بوو ، هەموویان بە جارێک مسولمان بوون ، کەوا ئیسلامیان پیّ گەشایەوە ، هەتا عبداللەی کوڕی مەسعود دەڵێت :- [ئیمان چەند ماڵێکی هەیە و ، نیفاقیش چەند ماڵێکی هەیەو ، یەکێک لە ماڵەکانی ئیمان بریتی‌یە لە ماڵی کوڕی موقەڕین ] ..!!

نەعمان سەبارەت بەمە دەڵێت :- [ چوار سەد پیاومان بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک ویستمان بەجیّی بهێڵین ، فەرمووی : ئەی عومەر ، پیّیان ببەخشە .. ئیمامی عومەر فەرمووی :- لە (بیت المال) تەنها خورما هەیە ، وا گومان دەبەم جێگای هیچ ناگرێت .... پێغەمبەر ﷺ پیّی فەرموو :- بڕۆ پێیان ببەخشە ... لەگەڵیان چووو بردینیە جێگاکەو ڕێزی لی‌نان ...

نەعمان بووە گەورەترین قارەمانی مسولمانان و پاسەوانیان ، بەهیچ جۆرێک حەزی نەدەکرد دوورکەوێتەوە لە گۆڕەپانی جیهادو ، بەڕاستی تێکۆشا بەبیّ کۆڵ دان لە جەنگی خەندەق ، هەروەها لە کاتی گرتنی شاری مەککە ئالای هۆزەکەی هۆزی (مەزینە ) ی هەڵگرت ، بەشداری لە جەنگەکانی هەڵگەڕاوەکان کرد بۆ کوژاندنەوەی ئەم فیتنەیەو ، بەشداری لە گرتنی (جند یسابور) و (السوس) و (کسکر) و گەلی شوێنی تر کرد ..دەتگووت خوای گەورە (نەعمان)ی دروست کردیە بۆ ئەوەی لەزەت و خۆشی لە ژیانی موجاهیدی و گۆڕەپانەکانی تێکۆشان وەربگرێت ، ئەگەر شتێک دوای خستبایە لە گۆڕەپانی جەنگ هەستی دەکرد بە دڵ تەنگی و ناخۆشی ، دووبارە هەوڵی

دەداو سەر لە نویێ بگەڕێتەوە بۆ گۆڕەپانی جیهاد . .

وایان بۆ دانا کەوا فەرمانڕەوایی (کسکر) بکات ، بەلاّم نەعمان بەم کارە هێمن و نەرمە دڵی توند بوو ، بۆ خەلیفەی مسوڵمانان ( عمری کوڕی خەتاب) خوا لی ی ڕازی بێت نووسی و پی ی گووت : (نموونەی من و مەسەلەی کەسکەر ، هەروەکو پیاوێکی گەنجە ، ئافرەتێکی خراپی لە تەنیشت بێت کەوا خۆی ڕەنگاو ڕەنگ وبۆندار بکات ، بۆ خوا پێت دەڵێم لە کەسکەر لام بدە ، بمنێرە ناو لەشکرێک لەلەشکرەکانی مسوڵمانان ، مێژوو وا بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا سەعدی کوڕی أبی وقاص ، سەرۆکی لەشکری مسولمانان لە دەڤەری فارس لەو کاتەدا. (نەعمان) ی کرد بە کارگێر بۆ کۆکردنەوەی داهاتی ولایەتی کەسکەر ، ئەمەش لەسەردەمی خەلیفە عومەر بووە ، نەعمان بۆ عومەری نوسی و گووتی :ـ[ سەعدی کوڕی أبی وقاص منی کردووە بە کارگێر بۆ کۆکردنەوەی داهات ، بەڕاستی حەز لە جیهاد دەکەم ، مەبەستم لە جیهاد کردنە ].

عومەر بۆ سەعدی نووسی و فەرمووی :ـ[ نەعمان کوڕی موقەڕین بۆی نووسیمەو واباس دەکات کەوا کردووتە بە کارگێر بۆ کۆکردنەوەی داهات ، ئەو حەز بەو کارە ناکات ، رەغبەتی لە جیهادە ، بینێرە بۆ گرنگترین شوێنت :ـ بۆ نەهاوەند] . . .

نەهاوەند شارێکە لە وولاّتی عەجەم ، ئەو کاتە کەوا گۆڕەپانی ململانی ی توندی نێوان مسوڵمانان و دوژمنەکانیان بوو ، خەلیفەش ویستی ئەم قارەمانیەتیەی نەعمان هەلقۆزێتەوەو شوێنێکی شیاوی بۆ بدۆزێتەوە بۆ سوودی ئیسلام ، لەبەر ئەوە ئەم کەلێنە پێویستەی بەم قارەمانە تێکۆشەرە پڕکردەوەو ، ئەویش گوێڕایەڵ بوو بۆ فەرمانی خەلیفەو زۆر پی ی کەیف خۆش بوو . . . . .

عومەری کوڕی خەتاب خوا لی ی ڕازی بێت پشتی بە نەعمان دەبەست لەچەند کاروبارێکی گرنگ ، لەبەر ئەوە کردی بە یەکێک لە نێردراوەکان ، کەوا فەرمانی بەسەعد ی کوڕی أبی وقاص دابیانێری بۆ (یزدجرد ) ی پاشای فارس بۆ چاوپێکەوتن و گفتو گۆ لەگەڵ کردنی . . . . .

نەعمان بە هاوڕێ نێردراوەکانی خۆی گووت : ئەگەر حەز دەکەن لە شوێنی ئێوە وەلاّم دەدەمەوە ، هەر کەسێکیش حەز دەکا با ئەو بەپێش بکەوێت .

هاوڕێکانی گووتیان :ـ بەڵکو قسە بکە . . . .

نەعمان قسەی کرد بەرامبەر (یزدجرد ) گووتی :ـ[ خوا بەزەیی بە ئێمە هاتەوەو ، پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین ، ڕێگای چاکەی پی نیشان داین ، فەرمانی بەچاکە پی کردووین ، وەخراپەشی پی ناساندووین ، وەقەدەغەی لی کردووین ، وەبەلێنیشی پی داوین پاداشتی خێری دونیاو ڕۆژی دوایی مان بداتەوە ، داواشی لەهەر هۆزێک بکردایە دەبوون بە دووچین :ـ چینێک لی ی نزیک دەبوونەوەو ، چینێکیش لی ی دوور

دەکەوتنەوە ، وەتەنها ئەو کەسانەش دەهاتنە ناو ئایینەکەی کەوا هەڵبژاردەبوون . . .

بەم جۆرە ماینەوە تاکو خوا حەزی کرد ، پاشان فەرمانی پێ کردین بانگی عەرەبەکان بکەین ، چی پێ گوتین کردمان ، بەدوو جۆر هاتنە پێشەوە :- هەندێکیان پاش ئەوەی بەناچاری هاتنە ناو ئیسلام پاشان نەیانتوانی خراپە بکەن ، چینێکیشان هاتنە ناو ئیسلام بە ئارەزووی خۆیان بڕوایان هێنا هەموومان گەورەیی ئەو شتەمان زانی کەوا لەسەرینەو پێشتر لەسەر دوژمنداری و ناخۆشی دابووین پاشان فەرمانی پێ کردووین دەست پێ بکەین بە میللەتەکانی دەوروبەرمان ، داوایان بکەین بۆ سەر ئیسلام ئێمە داواتان لی دەکەین بێنە سەر ئایینی ئیسلام چاکی چاکترکردو ، وەشتی ناشیرینیشی ناشیرنتر کرد ، ئەگەر یاخی بوون ئەوە نیشانەی خراپەیە ، سەرانە دانیش شتێکە باشترە لە ئەوی تریان کە ڕێگا خراپەکەیە ، ئەگەر ڕازیش نەبوون بەسەرانەدان ئەوە شەڕکردنە ، بەڵام ئەگەر ئایینی ئێمەتان وەرگرت وڕازی بوون پێی ئەوە کتابی خواتان بۆ بەجێ دەهێڵین ، بیکەن بە فەرمانڕەوا و فەرمان بەحوکمەکانی بکەن ، ئێمەش دەگەڕێینەوەو کاروباری وڵاتتان بەدەستی خۆتان دەبێت ، ئەگەر سەرانەش بدەن ڕازی دەبین و دەشتان پارێزین ، ئەگەر نا شەڕتان لەگەڵ دەکەین ] . . . . .

مغیرەی کوڕی زرارە لە پاش نەعمان قسەی کرد ، پاشان (یزدجرد) وەڵامێکی ووشکی دانەوە ، بەنێردراوەکانی گووت : بگەڕێنەوە بۆ لای گەورەکەتان ، پێی بڵێن من سەر لەشکری خۆم (ڕۆستم) یان بۆ ڕەوانە دەکەم تاکو لە بن خۆڵی بنێت و ئێوەش لە دۆڵی قادسیە لەبن خۆڵ دەنرێن . . . . پادشای فارس فەرمانی کرد کیسەیەک خۆڵی بۆ ئامادە بکەن و ، گووتی :- لە گەورەی ئەوانە باری بکەن ، پاشان بیان هاژۆن تاکو لەدەرگای مەدائین دەچنە دەرەوە . . . .

نەعمان مزگێنی ئەم خۆڵەیدا ، کەوا لەدەرەوە مانای سووکردنە ، بەڵام ئەو وای تەمەشاکرد نیشانەی ڕووخانی ئەوانە بە دەستی ئەوان ، کاتێ نەعمان گەڕاوە لای میللەتەکەی ، پرسیاریان لی کرد ئەویش وەڵامی دانەوەو گووتی : بەڕاستی خاکی ئەوانمان بۆ هێنان ، دەستیشی برد بۆ کیسە خۆڵەکە . . .

ئەم مزگێنیەش هاتەدی بەسەر کەوتنی مسوڵمانان لەشەڕی قادسیە . . ڕۆژان بەسەرچوو ، موجاهیدەکان هەر لە جیهاد کردن مانەوە . . . . . بەڵام کاروبار ناخۆش بوو و ، بەڵا هاتە پێشەوە ،دوژمنانی مسولمانان سەد و پەنجا هەزار جەنگاوەریان ،ئامادە کرد بۆ پەلاماردانی مسوڵمانان ، هەتا وای لێهات ئیمامی عومەر بە خودی خۆی دەریچێ بۆ ئەم جەنگەو سەرکردایەتی جەنگ بکات ، خاوەن ڕاوێژەکانی کۆکردەوە پێی گوتن:-

(ئەم ڕۆژە هیچ ڕۆژێکی تری لە دوا نیەو ، بەڕاستی هەموو توانایەکم بەکاردەهێنم بۆ ئەوەی ئەم کارە بکەم بۆی دەریچم بڕۆن بۆ جێگایەک لە نێوان دوو ناوچەی ئاوەدان بێت ،

پاشان بریاری دەرچونتان بدەن و ،پارێزگاری موجاهیدان بکەن تاکو خودا سەرکەوتن بە دەست مسولمانان دەهێنیّ و ، ئەوەی حەزی لیّ دەکات ئەو دەبێت) .

خەڵکەکە هەموویان ئامادەیان دەربری بۆ ئەم قوربانی دانە ، خەڵکەکەش وایان پێشنیارکرد خەلیفە لە شار بمێنێتەوە بۆ کاروباری راپەراندنی مسولمانان و ، دیاری کردنی پێشەوایەک بۆ ئەم جەنگەی کە دێتە پێشیان.

عومەر پیّی گوتن: پیاوێکی شیاوم بۆدیاری بکەن.. ئەوانیش ئەویان سەرپشک کرد بۆ ئەم کارە..

عومەر لێرەدا گوتی:ـ سوێند بەخوا ئەم کارە دەدەمە یەکێک پێشوازی لە شمشێر بکات ئەگەر بەیانی تووشی هات ، ئەوەش (نەعمان کوری موقەرین) بوو..

لە دوای نەعمانی نارد ، بینی لە مزگەوت نوێژ دەکات ، لە تەنیشتی دانیشت هەتا نوێژەکەی تەواوکرد ، پاشان پیّی گووت:ـ وای بۆ دەچم کارێکت پیّ بسپێرم ئەی نوعمان..

بەلام:ـ نەک پارە کۆکردنەوە ، بەلکو جەنگ..

عومەر دلنیای کردەوە بەم قسەیەی: کەوا تۆ موجاهیدی رێگای خوای ...

سەرۆکایەتی سوپای ئیسلامی دادەست ....

عومەری کوری خەتاب (خ.ر) بۆ نەعمانی نووسی لە نامەکە گوتی:ـ

بسم الله الرحمن الرحيم

لە بەندەی خوا عومەر ئەمیری بروادااران بۆ نەعمانی کوری موقەرین

سەلامت لیّ بێت

من سوپاسی ئەو خودایەی دەکەم بێجگە لە ئەو هیچ خودایەکی تر نیە بەلام پاشان ..

من پێت رادەگەینم کەوا چەند کۆمەلێک لە فارسەکان خەلکێکی زۆریان بۆ کۆکردینەوە لە شاری (نەهاوەند) ، ئەگەر ئەم نوسراوەی منت گەیشتیّ برۆ بە تەمای خوداو یارمەتی خوا وبەسەرکەوتنی خوا ، لەگەلّ ئەو مسولمانانەی لەگەلتن ، هەروەها لەشوێنێک مەیان هێلەوە کەندو کۆسپ بێت و ئازار بخۆن و ، کارێکی وایان پیّ مەسپێرە پاشان کافریان بکەیت و ، مەیان بە شوێنی بەترس وسامناک ، یەک پیاو لە موسلمانان خۆشەویسترە لەلای من لە سەدهەزار دینار ، ئیتر سەلامت لیّ بێت)..

بەندەی خوا

عومەری کوری خەتاب

ئەمیری بروادااران

پاشان عومەر دووبارە بۆی نووسیوە:ـ

(من کاروباری جەنگم دا دەست تۆ، برۆ بۆ ئەو شوێنەی کە پێت دەڵێم، تاکو دەگەیتە ناوچەی (ماە)، من بۆ خەڵکی کوفەم نووسیوە یارمەتیت بدەن، کاتێ موجاهیدەکانت کۆکردەوە برۆ بۆ (فەیرەزان)، فارسەکان لەم شوێنە خەڵکیان بۆ کۆکردینەوە، داوای سەرکەوتن لە خوا بکەن و، ئەم ووشەش زۆر بڵێنەوە: (لاحول و لا قوة الابالله).

گووتی: (خەڵکی کوفە بانگ بکە بۆ (ماە) لەوێ بە یەکتر بگەن، پاشان برۆن بۆ نەهاوەند، حوذەیفەی کوڕی یەمانم لە سەر کردوونە ئەمیر، هەتا دەگەنە لای نەعمان کوڕی موقەڕین بۆ (نەعمان) م نوسیووە :ـ ئەگەر تۆشتێکت بە سەر هات، حوذەیفەی کوڕی یەمان، ئەگەر ئەویش شتێکی بەسەر هات، نوعەیمی کوڕی موقەڕین ببێت بە ئەمیر)...

نەعمانی کوڕی موقەڕین لە گەڵ سی هەزار موجاهید دەرچوون (نوعەیمی کوڕی موقەڕین)ی برای دانا لە پێشەوەی لەشکر، هەروەها (سوەیدی کوڕی موقەڕین) ئەویش برای بوو، لە لای چەپی لەشکردانا، (حوذەیفەی کوڕی یەمان)ی لە لای ڕاستی لە شکر دانا..

بەم جۆرە مسوڵمانەکانی پێشوو پێشبرکێیان دەکرد بۆ ڕیزی پێشەوەی جیهاد، نەدەترسان و لە هیچ نەدەگەڕانەوە، ئەوەش نەعمانە دەبینین تەنها بەوە نەوەستا خۆی دوچاری ناخۆشی بکات، بەڵکو هەردوو براکەشی ئامادەی ئەم کارە پیرۆزە کرد، کردنی بە پێشەنگی مسوڵمانە تێکۆشەرەکان، نەوەکو لە دواوەی ڕیزەکان هەروەک ترسنۆکان دەیکەن !!

نەعمان بە خۆو بە سوپا بڕوادارەکەی دەرچوو و، مسوڵمانان ئامادە بوون بۆ جەنگی (نهاوند) کەوا بە ترسناکترین جەنگ دەژمێردرێت لە مێژووی ئیسلام، ئەمەش لە مانگەکانی بیست و یەکی کۆچی بوو..

لە زیرەکی ئیمامی عومەر ئەوەبوو کەوا پێغەمبەری خوای کرد بەسەرمەشقی خۆی لە دیاری کردنی چەند پێشەوایەک لەم جەنگە یەک لە دوای یەکە، هەروەکو لە جەنگی (موتئة) ڕوویدا، ئیمامی عومەر بە نەعمانی گووت: (تۆ ئەمیری، ئەگەر تۆ لێدرای حوذەیفەی کوڕی یەمان دەبێت بەئەمیر، پاشان جەریری کوڕی عبدالله، پاشان مغیرەی کوڕی شعبە، پاشان اشعثی کوڕی قەیس)... دەبینین... خەلیفەی مسوڵمانان پێنج سەرۆک دادەنێ بۆ ئەم شەڕە، بۆ ئەوەی موجاهیدان لە شەڕی درێژخایەن ڕابهێنێ و، ئارام و ورەیان زیاتر پێ بدات تاکو سەرکەوتن بە دەست دەهێنێن وڕاوەستانیان نەبێت.

پاش ئەوی نەعمان دەگات بە ناوچەی (ماهـ بهراذان) خەڵکەکە هاتنە لای و داوای ڕێککەوتنامەیان کرد، ئەویش وەڵامی دانەوەو: بەناوی خوا دەستی پێکردو، بەڵێنی

ئەوەی پێ دان کەوا دەستیان لێ نەدەن و هەر لە سەر ئایینی خۆیان بمێننەوە و بەگوێرەی شەریعەتی خۆیان بڕۆن هەروەها ئەوانیش بەڵێنیان دا هەموو سەرە سالان سەرانە بدەن بەوان ، هەروەها ڕێگا بەرێبوارانیان نیشان بدەن ولە شکری مسولمانان و شەوو ڕۆژێک دالدە بدەن هەروەها بە وەفابن لەگەڵ مسولمانان ، بەلام ئەگەر خیانەتیان کرد ئەوا ڕێککەوتنامەیەکە هەڵدەوەشێنەووە .. لەم ڕێککەوتنامەبە قەعقاعی کوڕی عەمرو کوڕی عبدالله ... ئامادەبوون لە موحەرەمی ١٩ کۆچی نووسرا .

بەم جۆرە مسولمانان ئامادەبوون بۆ جەنگ ونەعمان ئەم ئامۆژگاریانەی لە شکرەکەی کرد:

(خۆتان وپشتێنەکانتان چاک ببەستن قەیتانی پێلاوەکانتان توند بکەن و ، هەروەها خۆتان توندبکەن لەسەر وولاغەکانتان بە باشی پەتەکانیان بگرن و ،ئەمانە واتە ئەو (ئاگر پەرستانە خۆشی دونیای بۆگەنیان بۆ خەلک هێناوە ، گەرچی ئێوە ئیسلامتان هێناوە ،بەرگری لە ئایینەکەتان بکەن) ، پاشان نەعمان بەموجاهیدەکانی گووت : من سێ جار لە پێش ئێوە ئالا دەشەکێنمەوە کاتێک سێجار ئالاکەم شەکاندەوە تەکبیرم لێدا ،کەس ئاور لە کەس نەداتەوە ، ئەگەر نەعمان کوژرا کەس ڕانەوەستێت لە کاتی گەرمەی شەڕدا نەگەر ئەوکەسەمنیش بێت .. پاش ئەوەی بەڵێن و پەیمانی لێ وەرگرتن پاشان پیێ گوتن :

من داوای ئەم شتە لە خوا دەکەم ، سوێندم لەسەرتانە کەوا بەم دوعایە بڵێن ئامین ...

پاشان گووتی:

(خوایە شەهادەت ببەخشە بە نەعمان و سەرکەوتنیش ببەخشە بەمسولمانان)

پاشان دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو دوعای کردو گوتی:

(خودایە ، داوات لێ دەکەم چاوم ڕۆن بکەیتەوە بەم سەرکەوتنە کەوا عیززەتی ئیسلامی تێدایە ، منیش بەشەهیدی بۆ خۆت ببەوە .. پاشان خەلکەکەش هەموو ئامینیان بۆ ئەم دوعایانە کرد .....] ..

تاکو ساتی دەست پێ کردنی جەنگ هات و ، ئیشارەی دانیێ و ، موجاهیدان پەلاماریان دان و ، لەپێشەوەی هەمووان نەعمان کەوا دەیکوشت و بریندارى دەکردن لە ڕاست و چەپ ، تاکو ولاغەکەی لە خوێنی گۆڕەپانی جەنگ هەلدەخلیسکێ لە ئەنجامی ڕژانی خوێنێکی زۆر لە گۆڕەپانی جەنگ ، نەعمان لەسەر ولاغەکەی کەوتە خوارەوەو تاکو یەکێک لە دوژمنەکانی بەپەلە گەیشتە سەری و بەلێدانێکی وای لیێدا لە جولەی خست ...

نوعەیمی برای بینی نەعمان جوڵە ناکات ، وای زانی شەهید بووە ، بەپەلە پارچە قوماشێکی لەسەر داناو ، ئالاکەی لە دەستی وەرگرتەوەو ، دایە دەست (حوذەیفەی

کوڕی یەمان)

مسولّمانان لەم جەنگە سەرکەوتن و ،کاتیّ بینیان نەعمان کەوتووە ، تەعمان تەنها ئەوەندەی پێکرا بلّیّ : خوا چی بە موسلّمانان کرد .. ؟

وەلاّمیان داوە گووتیان :۔ خوای گەورە سەرکەوتنی بۆ هێنان ..

بەم جۆرە نەعمان وای هەست کرد ئێستا دەمرێت بەکەیف خۆشی و دلّنیایی ..

گووتی : الحمد لله کثیرا" ، ئەمە بۆ عومەر بنووسن ...

پاشان گیانی پاکی لە نەهاوەند بەخوای گەورە سپارد ، خوا لیّی ڕازی بێت

پاش ئەم جەنگە واتە جەنگی نەهاوەند ،فارسەکان نەیانتوانی بەرامبەر مسولّمانان بوەستن ، لەبەرئەوە ناویان لەم جەنگەنا (فتح الفتوح) ....

سەلامی خودا لەسەر شەهیدانی جەنگی نەهاوەند بیّ ......

٣٢

# عومەیری کوڕی وەهەب

گومڕای نەزانی و
ڕووناکی ئیسلام

# عومەیری كوری وەهەب

## گومڕای نەزانی و رووناكی ئیسلام

لە رۆژی بەدردا ، یەكێك بوو لە سەركردەكانی قورەیش، جەنگی دژی مسولمانان دەكرد...

عومەیر پیاوێكی چاو تیژو بیرتیژبوو لە لێكدانەوەو مەزەندەدا ، ئەوەبوو قورەیشیەكان ناردیانە سەر مسولمانان بۆ هێنانی دەنگ و باسی ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەر دەرچوبوون بۆ شەڕ لەگەڵ كردنیان ، بۆ ئەوەی تەماشا بكات بزانێ لە پشتیان بۆسەو یارمەتی هەیە ، یاخود نا ...؟؟

(عومەیری كوڕی وەهەبی جەمحی) بۆی دەرچوو بەخۆو بەئەسپەكەی لەدەوری سەربازگەی مسولمانان سوڕایەوە ، پاشان گەڕایەوەو بە قورەیشیەكانی گووت :[مسولمانەكان سێ سەد كەس زیاتر یان كەمتر دەبن] بەم جۆرە لێكدانەوەكەی ڕاست بوو.

پرسیاریان لێ كرد : ئایا لە پشتیان هیچ یارمەتی یەك هەیە ... وەلامی دانەوەو گووتی:[ لە پشتیانەوە هیچ نیە ، .. بەلام ئەی كۆمەلی قورەیش ، ئەوەی من بینیم ئەوانە مردنیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو ، میللەتێكن هیچ پەناو شوێنێك نی یە خۆی تێدا حەشار بدەن تەنها شمشێرەكانیان نەبێت ... (سوێند بەخوا وادەبینم یەك كەس لەوان بكوژن ئەوا یەكێكتان لی دەكوژنەوە ، ئەگەر بە گوێرەی ژمارەیان لە ئێوەیان كوشت ، ئنجا ئەو كاتە بۆ ئێمە ژیان سەرشۆری یە) .. ئنجا بیر لەم شتە بكەنەوە ] ...

هەندێك لە گەورەكانی قەرەیش ئەم قسانە كاری لی كردن و ، یەكێك لە مانە (اخنس) بوو ووتی : (بنی زهرة) خوا مالەكەتانی رزگار كرد كە (مخرمی كوڕی نوفل) ە لەناو كاروانەكەی (أبو سفیان) بوو ، ئێوەش بۆ رزگار كردنی ئەو مالەتان هاتوون ، ئیتر ئیشتان چی یە بەبێ سوود ئەڕۆن بۆ بەدر ، بە گوێ ی ئەم كابرایە مەكەن مەبەستی (أبو جهل) بوو ، بەم جۆرە (بنی زهر) ە یی یەكان گەڕانەوە بۆ مەكە .....

ئەوەبوو هەندێكیان پیاوەكانی خۆیانیان كۆكردەوەو رێگای مەكەیان گرتە بەر ، بەلام بەڕای (أبو جهل) گەڕانەوەیان بۆ مەككە نەمانەوە یان لە (بەدر) بۆ ماوەی چەند رۆژێك ئەوە دەگەیەنێ لە موحەمەدو یارەكانی ترساون و بەمە موحەمەدیش دەسەلات زیاد ئەكاو بانگەكەشی بلاو ئەبێتەوە ....

بەم جۆرە (أبو جهل) بیرو هۆشی كۆمەلەكەی تێكداو ، تووڕەیی و حیقدی لە دلی خەلكەكە ڕواند و ، شەڕی هەلگیرساند و ، خۆشی بووە یەكەم كوژراوی ئەم جەنگە نەفرەتی خوای لی بێت .

خەڵکی مەکە نازناوی (شيطان قريش) یان لە(أبو جهل) نابوو .. (شیطان قریش) بەڵایەکی زۆر گەورەی ناوە بۆ قورەیشییەکان نەخۆی قازانجی کردو نەمیللەتەکەشی. هێزەکانی قورەیش بە شکاوی و سەرشۆڕی گەڕانەوە بۆ مەککە ، ( عمير كوڕی وەهەبیش) گەڕاوە بۆ مەککەو کوڕێکی بە دیلی بەجێهێشت بە دەستی مسوڵمانان ... ڕۆژێک عومەیر کۆڕێکی ڕێکخست بەکوڕە مامەکەی (صفوان کوڕی أمیە) ... (صفوان) پیاوێک بوو ڕق و کینەکانی دەخواردەوە بۆ تۆڵە سەندن ، چونکە باوکی (أمیەی کوڕی خەلەف) لە جەنگی بەدر کوژرابوو و ، لە (قەلیب) نێژرابوو . (صفوان) و (عمیر) هەردووکیان دانیشتبوون ڕق و کینەی خۆیان هەڵدەڕشت ....

لێرەدا با لەگەڵ (عروه کوڕی زبیر) بین با ئەم هەواڵە درێژەمان بۆ باس بکات :
صفوان باسی کوژراوەکانی بەدری دەکرد گووتی: سوێند بەخوا ئەم ژیانەمان پاش ئەوان خێری پێوە نیە.....!!

عمیر گووتی : ڕاستت گووت ، سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر ئەم قەرزانەم نەبوایە ، ناتوانم بیدەمەوەو ، ماڵ و خێزانیشم لەوە دەترسم بەرەلا بن ، لەپاشە من ، دەنا ئێستا سوار دەبووم بۆ لای موحەمەد هەتا دەمکوشت من لەلای ئەو پاساوێکم هەیە ، پیی بچمە پێشەوە : دەڵێم من هاتووم بە مەبەستی ئەم کوڕە دیلەم .

صەفوان ئەم شتەی هەڵقۆستەوەو گووتی : قەرزەکەت لەسەرە من .. من لە جیاتی تۆ دەیدەمەوە. ماڵ و منداڵەکانت لەگەڵ ماڵ و منداڵی من جیاوازی ناکەم لە نێوانیان.

عومەیر پی‌ی گووت : کەواتە ئەم نهێنی‌یە بپارێزەو لە نێوان من و تۆ ...
پاشان (عومەیر) فەرمانی کرد شمشێرەکەیان بۆ تیژ کردو ژەهراویان کرد ، ئیتر ڕووی لە مەدینە کرد و بۆی دەرچوو....

کاتێک (عمر کوڕی خەتاب) لەگەڵ چەند کەسێک لە موجاهیدەکان باسی ڕۆژی بەدریان دەکرد و ، باسی شەهیدەکانیان دەکرد ، عومەر تەماشای کرد ، بینی وا (عومەیری کوڕی وەهاب) بارەکەی لە پێش مزگەوت خست ، شمشێرەکەی لە پشتی بەستا بوو ....

عومەر (خوا لی‌ی ڕازی بێت ) فەرمووی :. ئەو سەگە دوژمنی خوا عومەیری کوڕی وەهەبە ، سوێند بەخوا ئەوە دەبێ تەنها بۆ خراپە هاتبێ ... ئەوە بوو هەواڵی ئێمە دەبردو قورەیشەکانی لە ئێمە ئاگادار دەکردەوە ڕۆژی بەدر .. پاشان ئیمامی عومەر چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پی‌ی فەرموو :. ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە دوژمنی خوا (عومەیری کوڕی وەهەب)ە هاتووە شمشێری لەخۆ بەستاوە

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : بیهێنە ژوورەوە بۆ لای من .. (عومەر پشتێنی شمشێرەکەی لە ملی توند کردبوو ، بە پیاوەکانی گووت ئەوانەی لەگەڵی بوون لە ئەنصاریەکان ، بڕۆنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشن و ئاگاداری ئەو پیاوە پیسەبن ،

ئەمە پیاوێکی ئەمین نیە .. عومەر بردیە لای پێغەمبەر ﷺ ،پشتێنی شمشێرەکەی لە ملی کردبوو ، کاتێک پێغەمبەر بینی فەرمووی :ـ وازی لی بێنە ئەی عومەر ....
ئەی عومەیر نزیک بەوە ...
(عومەیر نزیک بۆوەو گووتی : بەیانیت باش ، ئەمەش سلاوێکی نەزانیە ..
پێغەمبەر ﷺ پیّی فەرموو :ـ خوا ڕێزی لی ناین بە سلاوێکی چاکتر لە سلاوەکەت ئەی عومەیر بەسەلام .. سلاوی خەلکی بەهەشت ..
عومەیر پیّی گووت :ـ سوێند بەخوا ئەی موحەمەد من بە قسەی سەردەم هەلس وکەوتم کرد .
پێغەمبەر ﷺ پیّی فەرموو :ـ بۆچی هاتووی ئەی عومەیر .. ؟؟
عومەیر گووتی :ـ هاتووم بۆ ئەو دیلەی کەوا لەبەر دەستانە ....
پێغەمبەر ﷺ پیّی فەرموو :ـ ئەی ئەم شمشێرەی لە ملتە چیە ... ؟؟
عومەیر گووتی :ـ خوا شمشێر ناشیرین کات ، ئایا هیچ سوودمان لی بینیوە ؟!
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ـ ڕاستم پیّ بلیّ ئەی عومەیر ، بۆچی هاتووی ؟
فەرمووی :ـ تەنها بۆ ئەم مەبەستە هاتووی .
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :ـ بەلکو تۆو صەفوانی کوڕی أمیە بە یەکەوە دانیشتن باسی کوژراوەکانی (قلیب) تان دەکرد لە قورەیشەکان ، پاشان گووتت :ـ ئەگەر لەبەر ئەم قەرزەی سەرم نەبوایە ، لەگەلّ مالّ و مندالم ، دەڕۆیشتم تاکو موحەمەدم دەکوشت ، صفوان باری قەرزەکەی بۆ هەلگرتی و لەگەلّ مالّ و مندالەکەت ، لەسەر ئەوەی بیّی منی بۆ بکوژی ، خواش پەردە بوو لە نێوان تۆو ئەو ......!!
لەم کاتەدا عومەیر هاواری کرد :ـ أشهد أن لا اله إلا الله ، وأشهد ان محمد رسول الله
ئەم ئیشە کەس ئامادە نەبوو تەنها من وصەفوان نەبێت ، سوێند بەخوا کەس ئاگاداری نەکردیەوە تەنها خودا نەبێت ، سوپاس و ستایش بۆ خودا کەوا منی هیدایەت دا بۆ ئیسلام ....
پێغەمبەر بە یاوەرەکانی فەرموو :ـ براکەتان لە ئایین شارەزا بکەن و فێری قورئان خوێندنی بکەن و ، ئەم دیلەشی بۆ ئازاد بکەن ] ....
بەم جۆرە عومەیری کوڕی وەهەب مسولمان بوو ..
بەم جۆرە (شەیتانی قورەیش) مسولمان بوو و ، ڕۆناکی پێغەبەرو ئیسلام دلی جۆش داو ، لە ساتێکدا لەم گومڕاییە بوو ، بوو بە ڕۆناکی و حەواری ئیسلام ..!!
عومەری کوڕی خەتاب دەفەرمووێت (خوا لیی ڕازی بێت)
[ سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ، بەراز خۆشەویستتر بوو لەلای من لە عومەیر ، ئەو کاتەی لێمان بەدیار کەوت .. بەلام ئەمڕۆکە لەلای من خۆشەویسترە لە هەندێک لە مندالەکانم ] ...!!

عومـەیر دانیشـت بـە قولآیـی بـیری لـە لیبووردەیـی ئـەم ئایینـەو گـەورەیی ئـەم پێغەمبەرە دەکـردەوە : هـەروەها بـیری لـە ڕۆژانـی ڕابـردوو دەکـردوە لـە مەککـە کـاتێک فێڵی لەئیسلام دەکرد و دوژمنایەتی دەکردن پێش کۆچکردنی پێغەمبەرو یاوەرەکانی بـۆ مەدینە . . .

پاشان بیری لە کردەوە خراپەکان و شەڕەکانی دەکردەوە لە ڕۆژی بەدر . . .

پاشان هەر ئەوە ئەمرۆکە شمشێری لەخۆی بەسـتاوەو بـۆ کوشـتنی پێغەمبـەر ﷺ ئـەم کـارو کـردەوە خراپانـەی لـە سـاتێکدا لەسـەر ڕەش دەبێتـەوە ، ئـەوەش بەووشـەی بـەرزی : (لااله إلا الله ، محمد رسول الله) . . !!

ئایا ئەمە چ لـێ بووردنێکەو ، چ لـێ خۆش بونێکەو ، چ بڕوابـوون بـەخۆ بونێکـە کـەوا ئەم ئایینە مەزنە هەڵیگرتووە . . . بەم جۆرە لەیەک ساتدا ئیسلام لـە هـەموو خراپـەکانی پێشوو خۆش دەبێـت و ، هەمووئـەو دوژمـنداری و خراپەکاریانـەی لـە یـاد دەچێتـەوە و ، دڵیان بۆ دەکاتەوەو باوەشیان پێ دەکا . . ؟!

بەم جۆرە ئـەو شمشـێرەی هـەتا دوێنـێ خراپـەو تـاوانی لەگـەڵ خـۆی هـەڵگرتبوو ، تـا ئێسـتاش شمشێرەکەی لەبەرچاویان بریسک دەداتەوە ، بەڵام ئەمانەیان هـەموو لـە یـاد چۆوەو ، تـەنها عومـەیر نـەبێت بە هـۆی مسـوڵمان بوونەکـەی ، لەیـەک سـاتدا بـوو بـە یەکێک لە مسوڵمانەکان و یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەهەموو خۆشی یـەک و ناخۆشی یەک هاوبەشە لەگەڵ مسوڵمانان . . .

بەم جۆرە ، لە ساتێکدا بووە خۆشەویستی عومەری کوڕی خەتاب کـە پێش ئـەم کاتـە نیـازی وابـوو بیکوژێـت ، ئێسـتاش خۆشەویسـتی لای عومـەر گەیشـتۆتە ڕادەی خۆشەویستی مندالەکانی . . ؟؟!!

ئەگەر لەیەک ساتی ڕاستگۆیی دا ، کەوا عومـەیر مسـوڵمان بوونـی خـۆی تێدا ئاشـکرا بکات ، بەم جۆرە ئیسـلام باوەشـی ڕێزو پاداشـت و گـەورەیی بـۆ بکاتـەوە ، کەواتـە ئـەم ئیسلامە دینێکی یەکجار مەزنە . . . .

لەم ساتەدا عومەیر فەرمانی سەر شانی بەرامبـەر ئـەم ئایینـە زانـی و ، بـۆ ئـەوەی بـە گوێرەی ئـەوەندەی دوژمنداری ئـەم ئایینـەی کـردووە خزمـەتیشـی بکـات ، وەئـەوەندە بانگەێشتنەی بۆ بکات بە گوێرەی ئەوەندەی دژایەتی کردووە ، ئەو شتانەیان پێ نیشـان بدات کەخواو پێغەمبەرەکەی پێی خۆشە لـە جیهـاد و خـوا پەرستی و ڕاسـتگۆیی ، بـەم جۆرە ڕۆژێک عومەیر دیداری پێغەمبەری خوا ﷺ دەکاو ، پێی دەڵێت :

[ ئەی پێغەمبەری خوا :. من شەرم کردووە بۆ کوژاندنەوەی ڕوونـاکی خـواو ، ئـازار دانـی ئەوانەی لەسەر ئایینی خوای گەورە بوون ، . . من حـەز دەکـەم ڕێگـام پـێ بـدەی بچمـەوە شاری مەککـە ، داوایـان بکـەم بـۆ سـەر ڕێگـای خواوڕێگـای پێغەمبـەرو ، بـۆ ئیسـلام ، بەڵکو خوای گەورە هیدایەتیان بدات ، وە ئەگەر نا ئازاریان بدەم چۆن کاتی خۆی ئـازاری یاوەرەکانی تۆم داوە لەسەر ئایینەکەیان ]

لەماوەی ئەم ڕۆژانەدا ، کەوا عومەیر مەکەی بەجێهێشتبوو ڕووی لە مەدینە کردبوو ، (صفوان کوڕی أمیە) عومەیری بەکرێ گرتبوو بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا ، زۆر بە فیزەوە لە کۆڵانەکانی مەکە دەڕۆیشت و ، زۆر بە کەیف خۆشی یەوە بەشداری کۆڕو کۆنگرەکانی دەکردن ..!

هەر کاتێک قورەیشی یەکان پرسیاری نهێنی ئەم کەیف خۆشیەیان لی دەکرد ، لەکاتێکدا ئێسکی باوکی هێشتا گەرم بوو لە شوێنەکانی بەدردا ، هەردوو ناو لەپەکانی لەناو یەکتری نابوو بە غروری بە خەلکی دەگووت :. (مزگێنی یتان بدەمێ بە ڕووداوێک ، پاش چەند ڕۆژێکی تر دەیبیستن ، ڕووداوی بەدرتان لەیاد دەباتەوە.!!).

هەموو بەیانی یەک دەچوە دەروازەکانی مەکە پرسیاری لە ڕێبوارو کاروانەکان دەکرد : [هیچ شتێک لە مەدینە ڕووی داوە ] ....

ئەوانیش وەلامیان دەداوە کەوا ڕازی نەبوو حەزی بەم وەلامە نەدەکرد ، هیچ شتێکمان نەبینیوەو نەگوێمان لی بووە گرنگ بێت لە شاری مەدینە ...

صەفوان بێزار نەدەبو کۆڵی نەدەدا لە پرسیارکردن لە کاروانەکان ، هەتا ڕۆژێکیان گەیشتە ڕێبوارێک پرسیاری لی کرد : ئایا لە مەدینە هیچ ڕووی تەداوە ؟؟

ڕێبوارەکە وەلامی دایەوەو گووتی :.بەلێ شتێکی زۆر گەورە ڕوی داوە ..!!

صەفوان ڕووی گەش بۆوە و لەکەیف خۆشیان ئاگای لە دونیا نەما......

دووبارە بەپەلەو کەیف خۆشی یەوە پرسیاری لەپیاوەکە کردەوە :(چی ڕوویداوە ؟ بۆم بگێڕەوە .... پیاوەکە وەلامی دایەوەو گووتی :.عومەیری کوڕی وەهەب بووە بەمسولمان ، ئێستا لە مەدینە فێری قورئان و شارەزای دەکەن لە ئایین ...)!!

صەفوان زەوی بەسەردا کەوت.. کوانێ ئەو ڕووداوەی مزگێنی پێ بدات بە میللەتەکەی ، کەوا چاوەڕێی دەکرد بۆ ئەوەی ڕووداوی بەدریان پێ لە یاد بباتەوە ، ئەمڕۆکە ئەم هەواڵە ڕوخێنەرە هەموو دلی پارچە پارچە کرد ...!!

ڕۆژێک ڕێبوار گەیشتەوە مالەوە ، بەلێ عومەیر گەڕاوە مەککەو شمشێرەکەی هەلکێشابوو ، ئامادە بوو بۆ شەڕ کردن، یەکەم کەس کە پێی گەیشت صەفوان کوڕی أمیە بوو ....

هەر کە بینی هەولی دا پەلاماری بدات ، بەلام ئەم شمشێرە ئامادەیەی هەلکێشابوو ، وای لە صفوان کرد بگەڕێتەوە هۆش خۆی و ، هەر ئەوەندەی پێکرا لە دوورەوە هەندێک جوێن بۆ عومەیر ڕەوانە بکات ، پاشان ملی ڕێگای گرت .. لەم کاتەی عومەیر گەڕاوە مەکە بە مسولمانەتی گەڕاوە ، کاتێک بەجێی هێشتبوو بە گاوری بەجێی هێشتبوو ... کاتێک گەڕاوە بۆ مەکە شێوەی مسولمان بوونی وەکوعومەری کوڕی خەتاب بوو ، مسولمان بوونی خۆی بە تەواوی ئاشکرا کردو هاواری کرد :

[سوێند بەخوا جێگایەک بەجێ ناهێلم کەوا داوای کوفرم بۆ کردبێ ، دەبێ لەم شوێنە

داوای ئیمان بکەم ] ... هەروەک ئەوەی (عومەیر) لەم ووشانە دروشمێکی وەرگرتبێ و ، لەم هەلوێستانەش پێشەنگی دروست کردبێ ، نەخشەی خۆبە کوشت دانی بۆ ئەم ئیسلامە کێشا ... لە کاتێک دا دوژمنداری کردبوو ، یەکێک لەو نەخشانەشی ئەوەبوو هەریەکێک بیوستبایە ئازاری بدات ، ئەوا قەبولی ئەدەکردو بەرپەچی ئەم ئازارەی دەداوە :. بەم جۆرە ئەوەی لە دەستی چو بوو قەرەبووی (تعويض) دەکردەوە ، لەگەڵ کات پێشبڕکێی بوو ، مزگێنی ئەم ئیسلامەی بەشەوو بەڕۆژ بە ئاشکرا بە خەڵک دەگەیاند ...

ئیمان و بڕوایی لەدڵی دا گڕی گرتبوو دڵی ڕووناک و جۆش دابوو ... ووشەی هەقی لە لێوەکانی دەباری و داوای یەکسانی و چاکە و خێری پێ دەکرد ... وەشمشێرەکەشی بەدەستی ڕاست گرتبوو ، جەردەو ڕێگرەکانی پێ دەترساند ، ئەوانەی دژایەتی ئایینی خواو بەرنامەی خوایان دەکرد و نەیاندەهێشت بانگی هەق بگات بە گوێچکەی مەردومان.

لەماوەی چەند هەفتەیەکدا ئەوانەی بڕواییان هێنا لەسەر دەستی (عومەیر لە کاروانێکی درێژدا لەگەڵیان دەرچوو بۆ مەدینە ... لێرەدا جێگای خۆیەتی بیابانیش سەری سووڕ بمێنی لەکاری ئەم پیاوە کاتێک شمشێرەکەی هەڵگرتبوو هەنگاوی تاوان و خراپەی دەهاوێشت بەرەو مەدینە بۆ کوشتنی گەورەترین و مەزنترین ئادەمیزاد لەسەر پشتی وولاخەکەی قورئان بە دەنگی زولاڵی داوود دەخوێنێ ....

ئەوە جارێکی تریش هەر هەمان پیاو بە خۆو بەکاروانێکی درێژی بڕوادار بە گرمەی ( الله أكبر) وتهليلە ڕێگای مەدینەیان گرتۆتە بەر ... بەڵێ ئەمە هەواڵێکی زۆر سەیرو مەزنە ... هەواڵی شەیتانی قوڕەیش کەوا خوای گەورە هیدایەتی دا بۆ ڕێگای پڕ ڕۆناکی ئیسلام، بوو بە یەکێک لە ئەصحابە و حەواری یە پاکەکانی ئیسلام و ، لە ژێر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ وەستاو بەشداری کرد لە هەموو غەزاو دیمانەکانی پێغەمبەر ... هەروەها پاش کۆچی دوایی پێغەریش گوێ ڕایەڵیەکی بێ وێنەی هەبوو بۆ ئایینی خوا .. هەروەها لە ڕۆژلی فەتحی مەکەش عومەیر هاوڕێ و خزمەکەی خۆی لە یاد نەچوو (صفوان کوڕی ئومەیە) ڕۆیشت بۆ ئەوە بانگی ئیسلامەتی بکات و داوای لێ بکات بڕوا بە ئیسلام بهێنێ ، پاش ئەوەی هیچ گومانێکی نەما لە ڕاستی پێغەمبەر و ڕاستی پەیامەکەی .... وادیار بوو صەفوان بارو بارگەی تێک ناو بەرەو (جده) لەوێ بپەڕێتەوە بۆ (یەمەن) بە دەریا ...

لێرەدا بەزەیی عومەیر هەڵسا بۆ صەفوان و ، نەخشەی کێشا بۆ گێڕانەوەی لە دەستی شەیتان بەهەر ڕێگایەک بێت ... بەخێرایی چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گووت : [ ئەی پێغەمبەری خوا ، صەفوان کوڕی ئومەیە گەورەی میللەتەکەی ، لە دەست تۆ هەڵاتووە بۆ ئەوەی خۆی بهاوێتە ناو دەریا ئەمانی بدە درووودی خوات لێ بێت پێغەمبەر فەرمووی :. صەفوان کەس دەستی لی نادات ، عومەیر پێی گووت :. ئەی پێغەمبەری

خوا نیشانەیەکم بدەریّ بۆ ئەوەی ئەمانی تۆ بناسیّتەوە ، ... پیّغەمبەر ﷺ ئەو چەفیەیدا بە عومەیر کە پیّی هاتبووە ناو شاری مەکە ...]

ئیّستاش با (عروە کوڕی زبیر) ئەم بەسەرهاتەمان بۆ تەواو بکات :

عومەیر چووە دوای تاکو گەیشتە صەفوان ،دایک و باوکم بە قوربانت بیّت ، أللە ، أللە دەتەویّ خۆت بە هیلاک بدەیت ، ئەوە ئەمانی پیّغەمبەری خوایە ﷺ بۆ تۆم هیّناوە !!!

صەفوان پیّی گووت: قوڕت بەسەری ، لە پیّش چاوم وون بەو قسەم لەگەڵ مەکە ...

عومەیر پیّی گووت :.ئەی صەفوان ، دایک و باوکم بە قوربانت بیّت ،پیّغەمبەری خوا ﷺ باشترین ئادەمیزادەو ، خیّر خوازترین مرۆڤەو ، چاکترین کەسە ، گەورەیی ئەو گەورەیی تۆیەو ، شەرەفی ئەو شەرەفی تۆیە ....

صفوان گووتی :من لەخۆم دەترسم .. (عومەیر لەگەڵی گەڕاوە تاکو بردیە بەر دەمی پیّغەمبەری خوا ﷺ )

صفوان بە پیّغەمبەری ﷺ گووت : ئەوا وا بانگەشە دەکات تۆ منت ئەمان داوە ..!!

پیّغەمبەر ﷺ فەرمووی : ڕاست دەکات

صەفوان گووتی : ڕیّگام بدە دوو مانگ بۆ ئەوەی بیربکەمەوە ....

پیّغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەوە چوار مانگ .. بۆ بیرکردنەوە ....

پاش ئەوەی صەفوان بووە مسولمان ، عومەیر زۆر زۆر کەیف خۆش بوو بە مسوڵمان بوونی بەم جۆرە کوڕی وەهەب بەردەوام بوو لەم کاروانە پیرۆزەی خوا ، بەدوای ڕیّ و شویّنی پیّغەمبەری مەزن ، کەوا خەڵکی پیّی هیدایەت دەدا لە گومڕایی بۆ ڕوناکی ئیسلام ....

٣٣

# عەمری کوڕی عاص

رزگارکەری میسر لە ژێر
جنجڕۆکی ڕۆمەکان

# عەمری کوڕی عاص

## رزگارکەری میسر لە ژێر جنجرۆکی ڕۆمەکان

سێ کەس لە قورەیشەکان ، زۆر بە توندی پێغەمبەری خوایان ﷺ ماندوو کردووەو دژی بانگەکەی وەستاون وئازاری یاوەرەکانیان داوە .... تاکو گەیشتە ئەم ڕادەیەی پێغەمبەر دوعایان لی بکات ، لەخوا بپارێتەوە سزایان بۆ بهێنێتە خوارەوە .... هەتاوای لێ هات هەر دوعای کردوهەر دوعای کرد ، نیگای بۆ هاتە خوارەوە بەم ئایەتە پیرۆزە ... [ليس لك من الأمر شيء ، أو يتوب عليهم ، أو يعذبهم ، فانهم ظالمون].

واتە :.( هیچ شتێک بەدەست تۆنیە ، یان لێیان خۆش دەبێت ، یان سزایان دەدات ، ئەوانە ..ستەمکارن) ...

پێغەمبەر ﷺ لەمانای ئایەتەکە گەیشت کەوا فەرمانی پێ دەکات واز لە دوعا بهێنێت و ، ئەم کارە بۆ خودای تاک وتەنیا بەجێ بهێڵێ ... یان لەسەر ئەم ستەمەی دەمێنێتەوەو ، ئنجا خوای گەورەش سزای دەدات ... یان پاشگەز دەبێتەوەو ، خواش پاشگەزبوونەوەکەی گیرا دەکاو بەزەیی خۆی بۆ ڕەوانە دەکات عەمری کوڕی عاص یەکێک بوو لەم سێ کەسە ... خودای گەورە ڕێگای پاشگەزبوونەوەو بەزەیی بۆ هەڵبژاردو ، هیدایەتی دا بۆ ئیسلام..

عەمری کوڕی عاص گۆڕا بۆ مسوڵمانێکی تێکۆشەرو کۆڵنەدەرو ، .. پێشەوایەک لە پێشەواکانی ئیسلامی شۆڕشگێر .... وە لەگەڵ هەندێک لە هەڵس و کەوتی (عەمر) کەوا ناتوانرێ قەنا عەتی پێ بهێنرێ ئەگەر تێبینی بکرێت ، بەڵام کار کردنی وەکو ئەصحابەیەکی بەڕێز بووە وتێکۆشاوەو کۆڵی نەداوە ، هەر دەمێنێتەوە لەناو دڵ و دەروونمان ..

لێرەدا بە تایبەتی لەمیسر ، ئەوانەی تەماشای ئیسلام دەکەن کەئایینێکی پتەو پاکە ، وە تەماشای پێغەمبەرەکەی دەکەن ڕەحمەتەکی نێردراوە ، وەنیعمەتێکی نەبڕاوەیەو ، پێغەمبەرێکی ڕاستگۆو مەزنە ، بانگی خەڵک دەکا بۆ ڕێگای خوا بۆمەبەستی یەکتا پەرستی و ، بۆ تێگەیشتن و خۆ پاراستن لە خراپە بەم جۆرە پەرە بە ژیان دەدات ...

ئەو کەسانەش هەرگیز لەیاد ناچن کەوا ئەم بڕوایی یە پتەوەیان لەگەڵ خۆیان هەڵگرت و بوونە هۆی هیدایەت دانی خەڵکی میسر بۆ ئیسلام ، ئیسلامیان بە دیاری هێنا بۆ میسرو ، ئەمەش باشترین دیاری بەر بووە ...

ئەم پیاوە بەڕێزەش :. (عەمری کوڕی عاص) ە (خوا لێی ڕازی بێت) مێژوو

نووسەکان وەصفی ئەم پیاوە دەکەن واتە (عەمر) بە (فاتح میسر) لە تێڕوانینی ئێمە ئەم وەصفە لە ڕاستی دەرچووە ، بەڵکو باشتر ئەوەیە وەصفی (عەمر) بکەین وبڵێین (ڕزگارکەری میسر..)

ئیسلام هیچ وڵاتێکی نەگرتووە بەم تێگەیشتنە نوێیەی ئێستا ، بەڵکو ڕزگاری کردوون لە دەسەڵاتی ئیمبریاتۆریەتی فارس و ئیمبریاتۆریەتی ڕۆم کەوا خەڵکیان کردبووە بەندەو وڵاتیان بە خراپترین ئازار ، ئازار دەدا...!

میسر لەم کاتەدا ، کەوا غەنیمەی ڕۆمەکان بوو ، پێشەنگەکانی ئیسلام پێی پیرۆزیان هێنا ناوەوە .. خەڵکی میسر بەرەنگاری ڕۆمەکان دەبوونەوە بەلام سوودی نەبوو ...

هەرکە دەنگی پۆلە بروادارەکان لە دەروازەکانی وڵاتیان دەنگی دایەوە :-

[ ألله أكبر ... ألله أكبر ....]

خەڵکی میسر هەر هەموویان بە پەلە بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەگەڵ بەدیار کەوتنی بەیانی پێشوازیان کردن و ڕزگار بوونی خۆیان لەدەست قەیسەرو ڕۆمەکان بینیەوە ...

عەمری کوڕی عاص و پیاوەکانی ، ئەو کاتە نەچوونە ناو میسر ، ... بەڵکو ڕێگایان لەپێش میسر کردەوە بۆ ئەوەی بگەن بە هەق و چارە نووسیان بگەن بە دادوەری ، ئەوەبوو خۆیان ڕاستیەکانیان بینیەوە ، لە ڕووناکی ووشەکانی خواو ، ڕێبازی ئیسلام.

عەمری کوڕی عاص - خوا لیی ڕازی بێت - سوور بوو لەسەر ئەوەی خەڵکی میسرو قیبتیەکان دوور بێختەوە لە جەنگ ، بۆ ئەوەی سەربازە ڕۆمەکان ڕوو بەڕوو ببنەوە لەگەڵ مسوڵمانان ، کەوا وڵاتەکەیان داگیر کردبوون و بژێوی ئەم خەلکەیان دەدزی ..

لە پێناوی ئەمەدا دەبینین عەمری کوڕی عاص لەگەڵ سەرکردە خاچ پەرستەکان و گەورە قەشەکانیان دەدوێ ودەڵێت :-

[ .. خوای گەورە موحەممەدی ڕەوانە کردووە بەڕاستی و ، فەرمانی گەیاندی ئەم پەیامەی پێ کردووە ...

ئەویش - سەلامی خوای لێ بێت - پەیامەکەی بەجێی خۆی گەیاندووە ، پاشان خۆی کۆچی دوایی کردو ئێمەی لەسەر ئەم ڕێگا ڕاستە هێشتەوە ....

یەکێک لەو فەرمانانەی بە ئێمەی کردووە ، ئاگادار کردنەوەی خەڵکە ، ئێمە داواتان دەکەین بۆ ڕێگای ئیسلام ...

هەر کەسێک بێتە ناو ئیسلام ، لە ئێمەیەو ، ئەوەی بۆ ئێمە بێت بۆ ئەویشە ، ئەوەی بۆ ئێمە نەبێت بۆ ئەویش نیە...

هەر کەسێکیش بانگی بکەین و نەیێتە ناو ئیسلام ، ئەوا دەرامەتی (جزیە) ی لەسەر دادەنێین پاراستنیشی داوێنە ئەستۆی خۆمان ..

پێغەمبەرمان هەوالی پێ ڕاگەیاندووین میسر لەسەر دەستی ئێمە ڕزگاری دەبێت و ،

پیێی ڕاسپاردووین لەگەڵ خەڵکەکە باش بین .. کە دەفەرمووێت :
لە دوای من میسر ڕزگار دەکەن ، وەسیەتتان دەکەم لەگەڵ قیبتیەکان باش بن ،
پاراستنیان لەسەر ئەستۆی ئێمەیەو خزمایەتیشمان هەیە لەگەڵیان ..
ئەگەر بە پیر بانگەکەی ئێمەوە هاتن لەسەر ئێمە پاراستنی ئێوەیە بە دڵنیاییەوە ..] .
عەمر لە قسەکانی بۆوەو ، هەندێک لە قەشەو پیاوە ئاینییە خاچ پەرستەکان
هاواریان کردو گووتیان :
[ ئەو خزمایەتیەی کەوا پێغەمبەرەکەیان وەسیەتی پێ کردووە ، ئەوە خزمایەتی یەکی
دوورە ، کەس پیێی ناگات تەنها پێغەمبەرەکان نەبێت ] ...
ئەمەش سەرەتایەکی چاک بوو بۆ تێگەیشتنی نێوان عەمرو قیبتیە میسری یەکان ،
سەرۆکە ڕۆمەکان هەولی کارێکیان دا بۆ تێکدانی ئەم ئومێدە ...
عەمری کوڕی عاص لە مسوڵمانە سەرەتایی یەکان نەبوو کە هاتە ناو ئیسلام ،
پێش گرتنی مەککە بە کەمێک لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید بووە مسوڵمان .....
ئەوەی سەیر بێ لێرەدا ئەوەیە مسوڵمان بوونی لەسەر دەستی (نەجاشی) حەبەشە
بوو ، نەجاشی عەمری دەناسی وڕێزی دەگرت بەهۆی ئەو هاتوو چوونە زۆرەی هەیبوو
بەسەر حەبەشەو ، ئەو دیاری یە بە نرخانەی هەڵیدەگرت و دەیبرد بۆ نەجاشی ، لە کۆتا
میوانداری کردنی بۆ ئەم وڵاتە باسی پێغەمبەر کرا ، کەوا بانگەشەی یەکتا پەرستی و
خووڕەوشتی بەرز دەکات لە دوورگەی عەرەب ...
پادشای حەبەشە پرسیار لە (عەمر) دەکات چۆن تاکو ئێستا بڕوای بە پێغەمبەر
نەهێناوەو بە دوای نەکەوتووە ، کەوا پێغەمبەرێکە لەلایەن خوا هاتووەو ڕاستە .. ؟؟
عەمریش پرسیاری لە نەجاشی کردو ، گووتی :.
[ ئەمە بەم جۆرەیە ؟ ؟] .. نەجاشی وەڵامی دایەوە :
[ بەڵێ ، گوێ ڕایەڵی بکە ئەی عەمر ، بەدواشی کەوە ، سوێند بە خوا ئەو لەسەر ڕاستی
یەو ، بەسەر ئەوانەش سەر دەکەوێ کە گوێ ڕایەڵی ناکەن ] ..!!
یەکسەر عەمر سواری کەشتی بوو لە دەریاو ، گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی و ، ڕووی لە
شاری مەدینە کرد بۆ ئەوەی ببێتە مسوڵمان و تەسلیمی خوای پەروەردگار ببێت ...
لە ڕێگای چوونی بۆ مەدینە تووشی بە تووشی خالیدی کوڕی وەلید دەبێت ، کەوا
دەچووە مەکە بۆ ئەوەی بگات بە خزمەتی پێغەمبەر و پەیمانی بداتێ لەسەر ئیسلام ..
هێشتان پێغەمبەریان نەبینیبوو کاتێک دەهاتن ، پێغەمبەر ﷺ ڕووی پیرۆزی گەش
بۆوەو بە یاوەرەکانی خۆی گووت :.
[ وا مەککە جگەر گۆشەکانی خۆی بۆتان ڕەوانە دەکات ] (خالید بە پێش کەوت و
مویایەعەی دا .... (عەمر) بە پێش کەوت ، گووتی :.
[ ئەی پێغەمبەری خوا ... من مویایەعەت دەکەم لەسەر ئەوەی خوای گەورە لە
گوناهەکانی پێشووم خۆش بێت ] پێغەمبەر ﷺ وەڵامی دایەوەو گووتی :. [ ئەی عەمر

.... موبایەعە بدە ، ئیسلام لە گوناهەکانی پێشووت خۆش دەبێت ] ....

(عـەمر) موبایەعـەی داو ئیتر ئـەم زیرەکـی و زۆرزانـی و ئازایەتیـەی لـە خزمـەتی ئیسلام بەکار هێنا .. کاتێک پێغەمبەری خوا گەیشتە بارەگای خوا ، عەمر فـەرمانڕەوا بوو لەسەر عومان لەخەلافەتی عومەر ئازایـەتی خۆی نیشـان دا لـە جەنگـەکانی شـام ، پاشان لە ڕزگار کردنی میسر لە دەستی فەرمانڕەوایی ڕۆمەکان ..

خۆزگە (عـەمری کـوڕی عـاص) تۆزێـک خـۆی بگرتبایـە لـە خۆشەویستنی ئیمـارەو دەسـەلات کـەوا ئەگـەر ئـەم خۆشەویستـییەو گەورایەتیـەی نەبوایـە لـە زۆر جێگـاو هەلوێستدا پلەی بەرزتر دەبۆوە .

عەمر شێوەی دەرەوەی و ، چۆنیەتی ڕۆیشتنی و ، قسە کردنـی ، خـۆی وانیشـان دەدا ، دروست بووە بۆ ئەوەی ئیمارەتی بدرێتە دەست ..!! هـەتا دەگێڕنـەوە ڕۆژێـک ئـەمیری بڕواداران عومـەری کـوڕی خـەتاب عـەمر بەرامبـەری دەهـات ، زەردەخەنـەکی بـرد بـە ڕۆیشتنەکەی و فەرمووی :-

[ نابێت بۆ باوکی عبدالله بڕوا لەسەر زەوی تەنها ئەمیر نەبێت ] .. ئەوەی ڕاستی بێت باوکی عبدالله خۆشـی ئـەم هەقـەی دابـووە خۆی کـە شـایانی ئـەم کـارە بـوو .. هـەتا ئەو کاتـەی ڕووداوی ترسـناک ڕووی لـە مسـوڵمانان کردبـوو ،عـەمر لـەناو ئـەم ڕووداوانـە دەخولایـەوە وەکـو ئـەمیرێک .. بـەڵێ ئـەمیرێک ، زیرەکـی و لـی زانـی لەگـەڵ خـۆی هەڵگرتبوولەگـەڵ توانایـەک وای لێکردبـوو بڕوایـی بـەخۆی بێـت و شـانازی بەسـەر کەوتنەکانی خۆی بکا ..!!

بەلاّم لەگەڵ ئەوەی ئەم ڕاسپاردەی پێ سپێردرابوو ، ئیمامی عومەر لـە هەلبژاردنی فـەرمانڕەواکانی زۆر تونـد بـوو ، جـارێک کـردی بـە فـەرمانڕەوای فەلەسـتین و ئـەردەن ، پاشان بە درێژایی ژیانی کرا بە فەرمانڕەوای میسر ...

کاتێک ئەمیری بڕواداران ئیمامی عومەر زانی کەوا (عـەمر) بـاری گوزەرانـی لـەوە دەرچووە کە ئیمامی عومەر بۆی دیاری کردوون و نابێت لەم سنوورە زیـادە ڕەوی بکـەن ، بۆ ئەوەی هـەموو کـاتێک لـە ئاسـتێک بێـت ، یـان بـەلای کـەمی ئاستیان وەک ئاسـتی گشتی خەڵک بێت .

بەلی ئەو کاتەی خەلیفەی مسوڵمانان زانی (عەمر) باری گوزەرانی لە ئاستی خۆی زیاتر بووە ، لـە فەرمانڕەوایـەتی لای نـەدا ، بـەڵکو (محمـد ی کـوڕی مەسـلەمە) ی بـۆ ڕەوانە کـرد فـەرمانی پـێ کـرد مـاڵ وسامانی (عـەمر) هەموو کۆبکاتـەوەو ، نیـوەی بـۆ بهێڵێتەوە و نیوەکـەی تـری لەگـەڵ خۆی هەلبگرێ و بیهێنـی بـۆ (بیت المال) لەشـاری مەدینە ...

ئەگەر ئەمیری بڕواداران بیزانیایە خۆشەویستی عەمر بۆئیمـارەت ، وای لـی دەکـات لمرادەی بباتەدەر لە لێپرسراوەتی ، بە هیـچ جۆرێـک ویژدانـی پـاکی نەیدەهێشت یـەک سات لەم وولاتە بمێنێتەوە ..

عەمر خوا لـی‌ی ڕازی بێت زۆر زیرەک و زۆر زانیێکی بەهێزو بیر تیژێکی بێ وێنە بوو ... تاکو ئەمیری بڕواداران ئیمامی عومەر خوا لـی‌ی ڕازی بێت ، کاتێک مرۆڤێکی بێ هێزو فەقیر حالی دەبینی ، ناو لەپەکانی لە یەکتر دەداو بەسەر سوڕمانەوە دەیگـوت :ـ [ سبحان الله .. !! دروست کـاری ئەمـەو ، دروست کـاری عـەمری کـوڕی عـاص یـەک خودایە ] !!

هەروەک ئەم پیاوە زۆر بە جورئەت و ، قارەمان بوو .... ئـەم جورئــەت و بــێ ترسی‌یەی تێکەڵ ببو لەگەڵ زۆرزانی‌یەکەی لە هەندێک شوێندا ، ترس و لەرز نەیدەگرت و زۆر بە لێزانی ئەم زۆرزانی یەی بەکار دەهێناو لەکاتی زۆر ناخۆش و فەوتێنەر ڕزگـاری دەبوو .. !

ئەمیری بڕواداران ئیمامی عومەر ئەم بەخششەی دەزانـی و ڕێزی خۆی لـێ دەنـا .. بۆ نموونە ، کاتێک ئیمامی عومەر ، عەمری ڕەوانە کرد بۆ وڵاتـی شـام پێش گەیشتنیان بە میسر ،، بە ئەمیری بڕواداراتی گووت :ـ لەناو لە شکری ڕۆم لە شـام ( پاڵـەوانێک ) هەیە یە کێکە لە ئەمیرە پێشەواو ئازاو زیرەکەکان .. ئیمامی عومەر وەڵامی دایەوە : [ بـۆ پاڵـەوانی ڕۆم ،پاڵـەوانی عـەرەبیان بـۆ دەهـاوێین ، تەماشـا دەکـەین کامــەیان کارویاریان لەبەر دەست سەرکەوتن دەهێنێ ] ..

ئەوەبوو پاڵەوانی عەرەب ، لێزانی زیرەک عەمری کوڕی عـاص ـ سەرکەوتنێکی بـێ وێنەی تۆمار کرد بەرامبەر پاڵـەوانی ڕۆم سوپاکەی بـە شکاوی بەجێهێشت و ڕای کرد بەرەو میسر ، کەوا پاش کەمێکی تر عەمر دەیگاتێ و ...بۆ ئەوەی لە سەر میسر ئاڵای ئیسلام بڵند کاتەوە ...

لـەزۆر هەڵوێست زیرەکی و زۆرزانـی عـەمر پرشـنگ دەداتـەوە ، بـەڵام ئێمـە ئـەم هەڵوێستە لەگەڵ ئەم هەڵوێستانەی تریدا بە هەڵوێست نازانین ئەمە ش کـاتێک لەگەڵ ئە بو موسای ئەشعەری ڕێکەوتن لـە سـەر ئـەوەی هەریـەکێکیان ئیمـامی عـەلی ـ خوای لـی‌ی ڕازی بێت لەگەڵ معاویـە لـەسـەر کـار لابـەن ، بـۆ ئـەوەی کـار بگەڕێتـەوە شێوەی ڕاوێژکردن لە ناو موسلمانان ، ئەبو موسا ڕێکەوتنەکەی بـەجێ گـەیاندو ، عـەمر بـەجی‌ێ نەگەیاند...

ئەگەر بمانەوێ دیمەنێک لە زیرەکی‌و زۆرزانی ، عەمر بزانین ، لەگەڵ سەرۆکی (قـەڵای بـابلیون ) لـەکاتی شـەری لـەگـەڵ ڕۆمـا ن لـــە میسـر ـ هـەروەک لــە گێڕانەوەیـەکی تـری مـێژوویی ـ ئەم ڕووداوەش لە شەری یەرموک لـەگەڵ پالـەوانی ڕۆم ڕوویدا...

پێشـەواو پاڵـەوانی ڕۆم داوای عـەمر دەکـات بـۆ ئـەوەی گفتوگـۆی لـەگـەڵ بکـات ، هـەروەها ئـەرەزانی ڕۆم فـەرمـانی کـرد بـە چـەند پیـاوێکی بـە دانـانـی بـەردێک لـە سـەر لێواری دیوارەکانی قەڵا یەکە کاتێک عـەمر هاتـە دەرەوە بکەوێتـە سـەری و عـەمر تـیرۆر بکات ، بۆ کاری تیرۆرکردنی عەمر هەموو شتێکی ئامادە کرد بۆ ئەوەی ڕاپەڕاندنی ئەم کارەکارێکی حەتمی بێت... عەمر چووە ناو قەڵاکـە بـەبێ ئـەوەی هەست بـەهیچ شتێک

بکات، پێکگەیشتنەکەیان تەواو بوو...
کاتێک لە رێگابوو بۆ ئەوەی لە قەلاکە بچێتە دەرەوە، هەستی کرد لەسەر شورەکانی قەلاکە جولانەوەی گومان لێکراو هەیە، ئینجا پێویستە لێی ئاگاداربێ و هەستی پێ بکات یەکسەر عەمر بەشێوەیەکی زۆر زانایانە خۆی لێ رزگار کرد.
گەراوە لای سەرۆکی قەلاکە لە چەند هەنگاوێکی هێمنانەو لەسەر خۆیانە هەر دەتگووت هەستی بە هیچ شتێک نەکردووە و لە هیچ نەترساوە، هەستی بەکارەکەی ئەو نەکردووە .....!!
لە سەرۆکەکە چووە ژوورەوەو ... پێی گووت :
شتێکم بە دلدا هات ویستم ئاراستەت بکەم .. لەگەلە من هەندێک ئەصحابە هەن ، کۆمەلێکن لە یاوەرەکانی پێغەمبەر لەسەرەتا هاتوونە ناو ئیسلام ، ئەمیری بڕواداران هیچ کارێک ناکات بەبێ راوێژی ئەوان، وەهیچ لەشکرێک رەوانە ناکات لە لە شکرەکانی ئیسلام ، دەبێت ئەوانە لەسەرەوەی جەنگاوەرو سەربازەکان بن ، تەماشام کرد ئەوانیش بهێنم، هەتا ئەوەی من گوێم لێ بووە ئەوانیش گوێیان لێ بێت ، بۆ ئەوەی کارەکە وەکو ئەوەی من لەسەریەو لێم روونە ئەوانیش لێیان روون بێت ..
سەرۆکی رۆم زانی و ماوەی دەرفەتی ژیانی عەمری دا بە سادەیی ...لەگەلی رێککەوت لەسەر قسەی ئەو ، تاکو عەمر دەگەرێتەوە لەگەل ئەم کۆمەلە هەلبژاردەیە ، هەموویان دەگرن و دەیانکوژن ، لە جیاتی ئەوەی عەمر بە تەنها بکوژن (عەمر) بە گەرمی مال ئاوایی لێ کردو ، تەوقەی لەگەل کرد ....
زۆرزانی عەرەب بە زەردەخەنەیەکەوە، قەلاکەی بەجێ هێشت ..!!
بۆ بەیانی عەمر گەراوە لەگەل لەشکرێک دەورەی قەلاکەیان دا ، سواری سەر پشتی ئەسپەکەی ببوو ئەسپەکەی دەیحیلاند و هاواری دەکرد بە دەنگێکی گالتە پێ کردنەوە.
بەلێ .. ئەم ئەسپەش شتێکی زۆری دەزانی لە زۆرزانی خاوەنەکەی ...!!
لە سالی چل و سێی کۆچی ، عەمر هەستی بە نزیک بوونەوەی مردن کرد لە میسر ، کاتێک فەرمانرەوایی میسری دەکرد ... عەمر لە ساتەکانی کۆچی دوایی کردنی ، ئەم ووتە بە نرخانەی پێشکەش کرد ، دەیفەرموو :-
[ .. من لە یەکەم کاتمدا گاور بووم ، لە هەموو کەس زیاتر دوژمنداری پێغەمبەری خوام دەکرد ئەگەر لەم کاتەدا بمردبامایە دەچوومە ناو ئاگر ... پاشان موبایەعەی پێغەمبەری خوام کرد ، ئەو کاتە کەس لەوی زیاتر خۆشەویستر نەبوو لە لای من هیچ کەسێک گەورەتر نەبوو لەئەو ، ئەگەر یەکێک پرسیاری چاکەی ئەوی لێم بکردبایە ، نەمدەتوانی وەلامیان بدەمەوە ..... لەبەر ئەوە نەمدەتوانی چاوم بنوقێنم لەبەر گەورەیی ئەو ، ئەگەر بمبردمایە ئەو کاتە ، تکام وابوو ئەهلی بەهەشت بم ... پاشان تووشی بەلا بووم بە وەرگرتنی دەسەلات و ، بە هەندێک شت نازانم بۆمنە ، یان لەسەرم دەکەوێت ] ...
پاشان دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و ، لە خوای گەورە پارایەوە و گووتی .

[اللهم لابريء فاعتذر، ولا عزيز فأنتصر، والا تدركني رحمتك أكن من الهالكين].
واته : پەروەردگارا من بێ تاوان نیم بۆ ئەوەی داوای لێ بووردن بکەم ، وەنەوەندە بە هێزش نیم بتوانم داوای سەرکەوتن بکەم ، ئەگەر بەزەیی تۆ نەمگاتێ دەبمە یەکێک لە فەوتاوەکان ... بەردەوام لە پاڕانەوەو نزا کردن بوو هەتاکو گیانی پاکی بەرزبۆوە بۆ لای پەروەردگارو ... کۆتا ووشەی :(لااله الا الله .. محمد رسول الله) بوو .. لەژێر خاکی میسر ، کەوا عەمر ڕێگای ئیسلامی تێدا بەخەڵک نیشان دا ، لاشەی پیرۆزی نێژرا .. تاکو ئێستاش بەدرێژایی تێپەڕبوونی چەند چەرخێک لەسەر مینبەرە پرشنگدارەکەی مزگەوتی عەمری کوڕی عاص ، یەکەم مزگەوت لە مێژووی ئیسلامی میسر ناوی خوای تاک وتەنیای لی دێت و ڕێبازی ئیسلامی تێدا ئاشکرا دەکرێت...
ڕەحمەتی خوا لە صەحابەی بەڕێزی پێغەمبەری خوا عەمری کوڕی عاص و هەموو ئەوانەی بەشداریان کرد لە ڕزگار کردنی شام و میسر و ئەفەریقا ...
[ پەروەردگارا هەروەک خۆت فەرمووتە ، من لەم صەحابانە ڕازیمە ... لە ئێمەش ڕازی بەو لێمان خۆش بە .. ]

٣٤

# سەعدی کوڕی موعاذ

لێت پیرۆز بێت ، باوکی عەمر

《٣٤》

# سەعدی کوڕی موعاذ

## لێت پیرۆز بێت، باوکی عەمر

لەتەمەنی سی ویەک ساڵیدا مسوڵمان بوو ........
لەسی و حەوت ساڵیدا ، بە شەهیدی کۆچی دوایی کرد .....
سەعدی کوڕی موعاذ لە نێوان ڕۆژی مسولمان بوونی و ، ڕۆژی شەهید بوونی ڕۆژانێکی سەخت و پرشنگداری بەسەر برد ، خوای گەورە لێی ڕازی بێت ....
تەماشاکەن .....!
ئەم پیاوە بالاّبەرزو بەڕێزو بە شان و شەوکەت و ڕووپاک و بەقەلاّفەت توونـد و تۆڵە دەبینن ...؟؟
ئەم پیاوە سەعدی کوڕی موعاذە ..

بە خێرایی و بەتووندی زەوی دەبڕێت بۆ ماڵی (ئەسعەدی کوڕی زوارە) دەچێت بۆ ئەوەی چاوی بەم پیاوە نوێنەرە بکەوێت کە لە شاری مەکە هاتووە بە ناوی (موصعەبی کوڕی عومەیر) کەوا پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ بۆ مەدینەی ڕەوانەکردبوو بۆ ئەوەی مزگێنی ئیسلام و یەکتاپەرستی یان پێ بدات ....

بەلێ ... ئەم پیاوە چوو بۆ ئەم شوێنە بۆ ئەوەی ئەم پیاوە غەریبە میوانە دەربکات بۆ دەرەوەی سنووری شاری مەدینە ، لە کاتێکدا ئایینێکی لەگەلّ خۆی هەلّگرتبوو ، بۆ ئەوەی ئەم ئایینە لە شاری مەدینە بەجێبهێلێت .... بەلاّم هێشتا لە کوڕەکەی (موصعەبی کوڕی عومەیر) نزیک نەبوو بۆوە لە ماڵی کوڕی پووری (ئوسەیدی کوڕی زوارە) تاکو بەم شەوقە شیرینەی کەوا هەلّیگرتبوو دڵ و دەروونی پێی ئاودراو دڵی پێی خۆش بوو ....

هێشتا نەگەیشتبووە نێو دانیشتووەکان و ، شوێنی خۆی نەکردبۆوە لە نێوانیان ، ووشە بە جۆشەکانی (موصعەب)ی بە گوێ کەوت و بووە هۆی ئەوەی خوای گەورە هیدایەتی بدات و گیان و دەروونی بەڕووناکی ئیسلام ڕووناک بکاتەوە ....

لە یەکێک لە ڕێکەوتە بە تواناو پرشنگدارو سەیرەکان ، گەورەی ئەنصارەکان (حەربە)کەی بۆ شوێنێکی دوور دەهاوێژێ و دەستی ڕاستی درێژ دەکات بۆ ئەوەی (بەیعە) بدات بەپێغەمبەری خوا ﷺ ....

بە مسولّمان بوونی (سەعدی کوڕی موعاذ) ڕۆژێکی نوێ لە شاری مەدینە هەلّدێ و تیشک دەداتەوە ، دلێکی زۆر لە گەردوونی کۆدەبنەوە لەگەلّ پێغەمبەرەکەیان موحەممەد تەسلیم بە خوای پەروەردگاری جیهانیان دەبن ....

سەعد مسولمان دەبێ و ... پاش مسولّمان بوونەکەی خووی قارەمانیەتی و

مەزنایەتی بەخۆوە دەگرێت .. کاتێک پێغەمبەری خواو یاوەرەکانی کۆچ دەکەن بۆ شاری مەدینە هۆزی سەعد (بنی عبد الأشهل) دەرگاکانیان والآ دەبێت بۆ کۆچ کردووەکان ، هەروەها ماڵ و سامانیان هەر هەمووی لە ژێر دەستیان دەبێت بەبێ منەت و دڵ گرانی و ژماردن ...!!

جەنگی گەورەی بەدر دێت ....

پێغەمبەری خوا ﷺ یاوەرەکانی لە کۆچکردوو یاریدەدەرەکان کۆدەکاتەوە ، بۆ ئەوەی ڕاوێژی کارەکانیان پێ بکات .... ڕووی پاکی دەکاتە لای یاریدەدەرەکان و دەفەرمووێت :

[ ئەی خەڵکینە ئاماژەم بۆ بکەن ...] ..

سەعدی کوڕی مەعاذ (خوا لێی ڕازی بێت) وەکو ئەوەی ئالآ هەڵبدەیت هەڵدەستێتەوەو دەڵێت :

[ ئەی پێغەمبەری خوا .... ئێمە بڕوایی یمان بەتۆ هێناوەو ، بەڕاستمان زانی و ، شایەدیمان دا ئەوەی تۆ هێناوتە هەقە ، لەسەر ئەم بەڵێن و پەیمانمان پێ داویت ... چۆنت دەوێت پێشمان کەوی ئەی پێغەمبەری خوا ، ئێمە لەگەڵت داین ... بەو خوایەی تۆی هێناوە بە هەق ، ئەگەر پێشنیارمان بکەیت خۆمان بهاوێینە ناو ئەم دەریایە ، لەگەڵت خۆمان دەهاوێینە ناوی ، یەک پیاو لە ئێمە دوا ناکەوێت ، پێشمان ناخۆش نیە بەیانی بگەین بەدوژمنەکانمان .. ئێمە ئارامان هەیە لە جەنگ ، لە کاتی بەیەکتر گەیشتن ڕاست دەکەین ... وا نزیکە خودا پێت نیشان بداو ، چاوت بە ئێمە ڕوون ببێتەوە ... بەبەرەکەتی خودا لەگەڵ خۆتمان بەرە ] .....

ووشەکانی سەعد وەکو مزگێنی دەرچوون ، ڕووی پاکی پێغەمبەر ﷺ لە خۆشی و ڕەزامەندی و بەختەوەری گەش بۆوەو ، بە موسڵمانەکانی فەرموو :-

[ بەڕێ کەون و مزگێنیتان بدەمێ ، خودای گەورە بەڵێنی یەک لەم دوو چینەی پێ داوم ، سوێند بەخوا هەروەک بڵێیت مەرگی ئەم میللەتە دەبینم ] ......

لە جەنگی (ئوحد کاتێک مسولمانان پەرت و بلاوبوونەوە بە هۆی ئەم ڕووداوە لە ناکاوەی سوپای گاوران تەنگی پێ هەڵچنین ، چاو نەیتوانی شوێنی (سەعدی کوڕی مەعاذ) بزر بکات و تێکۆشەرانە پاراستی و بەرگری لی کرد ، ئەمەش تەنها شایەنی ئەو بوو ....

ئەمجارە جەنگی (خەندەق) هاتەوە ، بۆ ئەوەی پیاوەتی ئەم نازایەتی یە بێ وێنەو گەورەیەی (سەعد) نیشان بدات : بەلآم جەنگی خەندەق ، نیشانەیەکی ئاشکراو ڕوون بوو دەربارەی فرت و فێڵەکانی جولەکە (نەفرەتی خوایان لی بێت) کەوا مسولمانان بەهەموو توانایەک خۆی یان لی ی دەپاراست ، لە ناکۆکەکانیان لە کاتێکدا ناکۆکەکەیان نەیاندەزانی دادو پەیمان چی یە ....

ئەم کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ یاوەرەکانی لە شاری مەدینە دەژیان بە ئاشتی

خـوای خۆیـان دەپەرسـت و ، ئامۆژگـاری یـەکتریان دەکـردو ، تکـاو هیوایـان ئـەوەبوو قورەیشەکان واز بهێنن لە جەنگ و پەلامار دان ، لەم کاتانەدا چینێک لە گەورەکانی جولەکە دزەیان دەکرد بۆ شاری مەکـە هانی قورەیشـیەکانیان دەدا دژی پێغەمبەری خـوا ﷺ ، هەولی ئەمەیان دەدا بەلێن پەیمان ببەستن لەگەل قورەیشیەکان ئەگەر دەرچن بۆ شەر کردن لەگەل مسولمانان ... ئـەوەبوو ئـەم کارەشیان کـردو لەگەل بێ باوەرەکـان رێککەوتن ، لەگەلیان پیلانی جەنگ و هێرش بردنیان دانا ... لە رێگای گەرانـەوەیان بۆ شاری مەدینە لەگەل گەورەترین هۆزی عەرەب ، ئەمەش هۆزی (غطفان) بوو دانیشتن ، پێکهاتن لەگەل گەورەکانیان کەوا پشت بدەنـە سوپای قورەیـش .. پیلانـی جەنگیان دارشت و ، بەشدار بوونەکەیان تێیدا دیاری کرد ... کـەوا قورەیـش و (غطفـان) بـە سوپایەکی لەبن نەهاتوو پەلاماری شاری مەدینە بدەن ....

جولەکـەش لـەناو شـاری مـەدینـە هەلـسـن بـە دەوری تـابووری پێنجـەم واتـە دەوری تێکدان ببینن لەم کاتەی سوپای پەلاماردەر هێرش دەهێنێت ..

کاتێک پێغەمبەری خوا بەم پیلانە ستەمکارانەی جولەکەی زانی هەلسـا بـەر پـەچ و هۆی بۆ دروست کرد ، بە راوێژی لەگەل مسولمانان و قەبوول کردنی بـیروڕای (سەلمانی فارسی) (خەندەق) ی لە چوار دەورەی مـەدینە هەلکەند بۆ ئەوەی تەگـەرە بخاتـە سوپای پەلاماردەر ... هەروەها سـەعدی کـوڕی موعـاذ و سـەعدی کـوڕی عوبـادەی بـۆ گـەورەی جولـەکەی (بني قريظـة) رەوانـە کـرد ، بـۆ ئـەوەی بە تـەواوی هەلوێستی ئەمانە بـۆ ئـەم جەنگە چاوەروان کراوە بـە دیـار بکـەوێت ، چونکـە لـە نێـوان پێغەمبـەری خـواو ﷺ جولەکەی (بني قريظة) بەلێن و پەیمان هەبوو .....

کاتێک نوێنەرانی پێغەمبەر بە گـەورەی جولـەکەی (بنـي قريظـة) گەیشـت لـە ناکـاو بەهەردوو نوێنەریان گووت : [لە نێوان ئێمەو موحەممەد بەلێن و پەیمان نیە ] ...!!

پێغەمبەر ﷺ لای گران بوو ، کەوا خەلکی مـەدینە دووچاری ئـەم جەنگـە تێکدەرەوو ئەم گەمارۆ لە هێز خستووە ببێتـەوە ، بـیری لەمـە کـردەوە چۆن (غطفـان) لـە قورەیـش بکاتەوە ، بۆ ئـەوەی نیـوەی هـێزو لەشکری پەلامار دەر کـەم بکاتـەوە ، ئنجا بەراستی رۆیشت بۆ ئەوەی گفتو گـۆ لەگـەل گـەورەکانی (غطفـان) بکـات لەسـەر ئـەوەی دەسـتیان هـەلبگرن لـەم جەنگـە ، لـە بـری ئەمــە سـێ یـەکی بـەروو بوومی مەدینـەیان بدەنـی . گـەورەکانی غطفـان بەمـە رازی بـوون ، هیـچ نـەماوە تـەنها ئـەوە نـەبێت رێککەوتنەکـە تۆمار بکرێت لە بەلگەنامەیەکی مۆرکراو ....

لەم ماوەیەدا کەوا هەولی بۆ دا ، پێغەمبەری خوا ﷺ وای تـێڕوانی ئـەم مافـە تـەنها مافی تاکە کەسی ئەو نیە ، داوای راوێژی لە یاوەرە بـەرێزەکانی کـرد ـ خوا لـی‌یـان رازی بێـت ... پێغەمبـەر ﷺ گرنگی‌یـەکی تایبـەتی بـە بیروڕای سـەعدی کـوڕی مـەعاذ و ، سەعدی کوڕی عوبادە دا ،،،،، کەوا هەردووکیان گەورەی شاری مەدینە بوون و ، لە بەر ئەوەی ئەم دوو کەسە مافە ئەوەیان هـەبوو یەکـەم کەسـن بـن راوێژیـان لەگـەل بکرێت و ،

هەڵوێستیان بدەن دەربارەی ئەم مەسەلەیە . . .
پێغەمبەری خوا ﷺ چیرۆکی ئەم گفتوگۆیەی بۆ گێڕانەوە کەوا ڕوویدا بوو لە نێوان ئەم و لە نێوان گەورەکانی غطفان . . . وای پێراگەیاندن کەوا بۆیە پەنای بۆ ئەم هەوڵدانە بردووە ، لە پێناوی ئەوەی ئەم پەلامارە ترسناکو ئەم گەمارۆ فەوتێنەرە لە سەر شاری مەدینەو خەڵکەکەی لاببات ، هەردوو سەعد هاتنە پێشەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بەم پرسیارە :-
[ ئەی پێغەمبەری خوا . . . .
ئایا ئەم بیروڕایە هەڵتبژاردووە ، یاخود نیگایەکە خوا فەرمانی پێ کردوویت ] ؟؟؟
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :
بەڵکو بۆ چوونێکە بۆ ئێوەم هەڵبژاردووە . . . .
[سوێند بەخوا ، ئەوەم نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت لەبەر ئەوەی بینیومە عەرەب لە یەک بازنە واتە هەموو بەیەکەوە دەورەتان دەدەن و ، لە هەموو لایەک پەلامارتان دەدەن ، ویستم هێزو توانایان بشکێنم و پەرتەوازەیان پێ بکەم . .] . .
(سەعدی کوڕی موعاذ ) هەستی بەمە کرد کەوا هێزو توانایان وەکو مێرخاسان و بڕواداران دەکەوێتە بەر تاقیکردنەوە ، بەڵام چ تاقیکردنەوەیەک . . !!
لێرەدا گووتی :-
[ ئەی پێغەمبەری خوا . . ئێمەو ئەوان لە کاتێکدا لەسەر هاوەڵ پەیدا کردن و پەرستنی بت بووین خوامان نەدەناسی و نەدەپەرست ، چاویان لەمە نەبوو یەک دەنکە خورما لە شارەکەمان بخۆن ، تەنها بەڕێز لێنان و میوانداری و فرۆشتن نەبێت . . . پاش ئەوی خوای گەورە ڕێزی لێناوین بە ئیسلام و ، هیدایەتی داین و ، بەتۆو بەخوا گەورە بووین ،ماڵی خۆمانیان بدەینێ . . ؟؟
سوێند بەخوا ئێمە پێویستمان بەم ڕێککەوتنە نیە . .
سوێند بە خواش بێجگە لە شمشێر هیچی تریان نادەینێ ، تاکو خوای گەورە فەرمان لە نێوان ئێمەو ئەوان دەکات] . . !!
پێغەمبەر ﷺ یەکسەر قسەی لەگەڵ ئەوان کردەیەک و ، هەواڵی دا بە گەورەکانی (غطفان) کەوا یاوەرەکانی ئەم گفتوگۆیەیان ڕەت کردۆتەوە ، ئەویش پابەندە بە بیروڕای ئەوان و جێ بەجێی دەکات . . .
پاش چەند ڕۆژێک شاری مەدینە ئەم گەمارۆ ترسناکەی بە چاوی خۆی بینی . . .
ئەوەی ڕاستی بێت خۆی بۆ خۆی ئەم گەمارۆیەی هێنا کایەوە ، زیاتر لەمەی لەسەری بچەسپێت بەهۆی ئەم خەندەقەی هەڵیانکەند لە دەورەی بۆ ئەوەی ببێت بە قەڵغان و پارێزگاری . . .
مسوڵمانان جل و بەرگی جەنگیان پۆشی . . .
(سەعدی کوڕی موعاذ ) شمشێرو ڕمەکەی هەڵگرت و بۆی دەرچوو و ئەم هۆنراوەی

دەخوێندەوە :

لبث قليلا" يشهد الهيجا جمل     ما أجمل الموت إذا حان الأجل !

لەیەکێک لە سوڕانەوەکانی بۆ سەر بەرەکانی جیهاد ، تیرێک بە توندی بۆ (سەعد) دێ و بە شانی دەکەوێت ، ئەمەش یەکێک لە هاوبەش پەیدا کەرەکان بۆی دەهاوێت ..

تیرەکە دەماری دەگرێت خوێنی بە توندی لی دێت ، ئنجا بەخێرایی فریاکەوتنێکی کاتی یان بۆ کرد بۆ ئەوەی خوێنەکە ڕابوەستێت ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد هەڵیانگرت بۆ مزگەوت و ، هەروەها خیوەتێکی بۆ هەڵبدەن بۆ ئەوەی هەموو کاتێک لە کاتی تیمار کردنی لە پییغەمبەری خوا ﷺ نزیک بێت ....

بەم جۆرە مسوڵمانان ئەم گەنجە قارەمانە خۆشەویستەیان هەڵگرت و بۆ شوێنی خۆی لە مزگەوتی پێغەمبەر .. سەعد (خوا لـێی ڕازی بێت) سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و گووتی :

[ خودایە ئەگەر تۆ جەنگێکت هێشتۆتەوە لەگەڵ قورەیش ، بۆی بمهێڵەوە .... لەبەر ئەوەی هیچ کەس نیە وەکو من حەز بکات جیهاد بکات لەگەڵ میللەتێک کەوا ئازاری پێغەمبەرەکەیان دایت و ، بە درۆیان خستەوەو ، لە ماڵی خۆی دەریانکرد .... وە ئەگەر هیچ جەنگێکت نەهێشتۆتەوە لە نێوان ئێمەو ئەوان ، ئیمڕۆکە وا م لێبکەیت بەوەی بەسەرم هاتووە ڕێگای شەهادەتم پێ بگریت .. وە نەمرێنیت تاکو چاوم ڕوون دەبێت بە شکستی (بني قريظة) .. ]

خوا پشت و پەنات بێت ئەی سەعدی کوڕی موعاذ ...

کێ دەتوانێت ئەم قسەیە بکات وەک تۆ ، لەم کات و ساتەدا بێجگە لەتۆ ... ؟؟

خودای گەورە دوعاو پاڕانەوەکەی قەبوول کرد ....

ئەم لێدانەی پـێی کەوت ڕێگای شەهادەتی پـێ گرت و ، پاش مانگێک بە پەروەردگاری گەیشت بەهۆی کار لێکردنی ئەم زامەی لەشی ... بەلام کۆچی دوایی نەکرد تاکو دڵ و دەروونی خۆش بوو بە (بنـي قريظـة) .... ئەمەش ئەو کاتە بوو پاش ئەوەی قورەیش نا ئومێد بوون لە گەمارۆی شاری مەدینەو دلە ڕاوکـێ کەوتە نێو ڕێزەکانی سوپاکەیان ، بارو بارگەیان تێک ناو ، بە ڕیسوایی گەڕانەوە بۆ شاری مەککە.

پێغەمبەری خوا ﷺ وای تێڕوانی ئەگەر وازبهێنێت لە جولەکەکانی (بني قريظـة) ، هەر کاتێک دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێ و حەز بکەن ژەهری خۆیان دەڕێژنە سەر شاری مەدینە ، فەرمانی دا لەهەقی خۆی خۆش نەبێ و لـی یان نەبوورێت .....

لێرەدا فەرمانی کرد بە یاوەرەکانی بچنە سەر (بني قريظة) ....

ئەوەبوو بیست و پێنج ڕۆژ گەمارۆیان دان .... پاش ئەوەی جولەکەکان بۆیان دەرکەوت کەوا ڕزگار بوونیان بۆ نیە ، خۆیان دا دەست و ، بەتکاو پاڕانەوە چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لـی کرد کەوا (سەعدی کوڕی موعاذ بهێنێت و فەرمانیان

لەسەر دەربکات .. لەبەر ئەوەی سەعد هاوپەیمان و لایەنگریان بوو لە سەردەمی جاهیلی ...
پێغەمبەری خوا ﷺ بە یاوەرەکانی ناردی (سەعدی کوڕی موعاذ)ی بۆ بهێنن کەوا لە ژێر خێوەتەکەی لە مزگەوتەکەی تیمار دەکرا ... ئەوەبو لەسەر ولاغێک هێنایان و ، کەوا ئازاری ماندوویەتی ونەخۆشی دەچێشت ـ پێغەمبەر ﷺ بە سەعدی فەرموو :
[ فەرمان لەسەر (بني قريظة) بدە ، ئەی سەعد...
ئیتر (سەعد) هەواڵە بێ ویژدانەکانی جولەکەی هێنایە بیرە خۆی کەوا لە جەنگی خەندەق خەریک بوو خەڵکی مەدینە بەلەناوچوون بدەن ...
سەعد گووتی :
[ من واتە تەماشا دەکەم جەنگاوەرەکانیان بکوژرێن و .... ئەوەو منداڵەکانیان بکرێن بە بەندەو .... موڵک و ماڵیشیان دابەش بکرێت .... ]
بەم جۆرە (سەعد) کۆچی دوایی نەکرد تاکو دڵ و دەروونی گەش بۆوە بە (بني قريظة)..
برینەکەی (سەعد) هەموو ڕۆژێک مەترسی زیاتر دەبوو ، بەڵکو هەموو کاتژمێرێک... ڕۆژێک پێغەمبەری خوا چووە سەردانی ، بینی سەعد لەساتەکانی ماڵ ئاوایی‌دا دەژی ، پێغەمبەری خوا چووە سەردانی ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەری هێنا لە کۆشی خۆی داناو ، پارایەوە بەم دوعایە :
[پەروەردگارا سەعد بەڕاستی جیهادی کرد لە ڕێگاکەت ، ڕاست بوو لەگەڵ پێغەمبەرەکەت و ئەوەی لەسەر ئەستۆی بوو بەجێیهێنا ، بەباشترین شێوە گیانی وەرگرە هەروەک باشترین گیانت وەرگرتووە ]
ووشەکانی پێغەمبەر ﷺ وەکو بارانی ڕەحمەت کەوتە سەر گیانی ماڵ ئاوایی سەعد بەبێ ئەوەی ئازاری بدات .. سەعد بەزەحمەت هەوڵی‌دا ، چاوەکانی کردەوە بە مەبەستی ئەوەی بۆ دواجار لە ژیانی ڕووی پێغەمبەرەکەی ببینێت ، گووتی : [السلام عليك يا رسول الله أما إني لأشهد رسول الله ] ..
واتە : سەلامی خوات لی بێت ئەی پێغەمبەری خوا ... من شایەدی دەدەم تۆ پێغەمبەری خودایت ... پێغەمبەر ﷺ لەم سات و کاتەدا ڕوانیە ڕووی سەعد و فەرمووی :
[ هنيئا" لك أبا عمر ] .. لێت پیرۆز بێت باوکی عەمر .....
أبو سعیدی خودری (خوا لی‌ی ڕازی بێت) دەڵێت :
[ من لەوانە بووم گۆڕمان هەڵدەکەند بۆ سەعد .... ئێمە هەر کاتێک چینێک لە خۆڵمان هەڵدەکەند ، بۆنی میسکمان دەکرد ... تاکو گەیشتینە ئەلحەد] ....
کۆچی دوایی سەعدی مەزن کارێکی گەورەی کردە سەر دڵ و دەروونی مسوڵمانان .. بەڵام بەمە دلی خۆیان دەدایەوەو ، کەیف خۆش بوون ، کاتێک گوێ یان لە پێغەمبەرە بەڕێزەکەیان بوو فەرمووی :

[ لقد اهتز عرش الرحمن لموت سعد بن معاذ ] ...
واته عەرشی خودا لەرزی بە مردنی سەعدی کوڕی موعاذ ....

لێرەدا ئێمەش پیرۆزبایی لە سەعدی کوڕی موعاذ و هەموو شەهیدانی ڕێگای خودا دەکەین لەهەموو کات و سەردەمێکدا کەوا ئەم بازرگانیەیان لەگەڵ خوای خۆیان کرد ، لە بڕی گیانی پیرۆزیان بەهەشتی پان و بەرینیان پێ بەخشراو خوای گەورەیان لە خۆیان ڕازی کرد ....

٣٥

# حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاری

ئەو بڕوادارەی بە بچووکی
بەیعەی دا بەپێغەمبەر ﷺ
کاتێك گەورەش بوو بۆی
بەوەفابوو

﴿٣٥﴾

# حەبیبی کوڕی زەیدی ئەنصاری

## ئەو بڕوادارەی بە بچووکی بەیعەی دا بەپێغەمبەر ﷺ

## کاتێك گەورەش بوو بۆی بەوەفابوو

لەماڵێک ، هەموو سووچ و کەلێنەکانی شیرینی ئیمان بلاّوەی کردبوو ...

هەموو شێوەکانی بەرخودان و خۆبەکوشتدان لە نێو چەوانی خەڵکە جێنشین بووەکە بریسکایەوە ..

بەڵێ حەبیب کوڕی زەیدی ئەنصاری لەم ماڵەدا پەروەردە بوو ، خووی بەم سیفەتە مەزنانەوە گرت ..!!

باوکی ئەم (زەیدی کوڕی عاصم) کەوا پێشەنگی مسوڵمانان بوو لە (یثرب) وەیەکێک بوو لەم حەفتا کەسەی کەوا بەیعەی عەقەبەیان بینی و لەگەڵ خێزان و کوڕەکانی دەستیان لەناو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ناو مویایەعەیان کرد....

دایکی کە ناوی (ام عمارە) نەسیبەی مازنی بوو ،ئەو ئافرەتەی یەکەم ئافرەت بوو چەکی هەڵگرت بۆبەرگری لە ئایینی خواو ، بەرگری لە موحەممەدپێغەمبەری خوا ﷺ.

براکە ی کەوا ناوی (عبدالله کوڕی زەید)بوو لە کاتێدا لە شەری ئوحد گیانی خۆی بە پێش گیانی پێغەمبەری خوا ﷺ خستبوو ، سینگی خۆی کردبوویە قەڵغان بۆتیرو شمشێرەکانی دوژمنانی خوا..تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەیان فەرمووی :.

بارك الله عليكم من اهل بيت

رحمكم الله من اهل بيت

واتە خوا گەورە ئەم بنەماڵەیە پیرۆزکات ، خوا ڕەحم بەم بنە ماڵە یە بکات ...

ڕووناکی خوا ڕووی کردە دڵی حەبیبی کوڕی زەید لە کاتێکدا گەنجێکی تەڕ بوو ، ئەم ئیمانە جێگاو شوێنی خۆی لە دڵ ودەروونی زەید گرت وبە هیچ جۆرێک لیی جیا نەبۆوە ...

خوای گەورە وابۆی نووسی لەگەڵ باوک ودایک وپووری و برا یەکەی بەرێ کەون بۆ شاری مەکە بۆبە شداربوون لەگەڵ ئەم حە فتا کەلە پیاوەی کەوا مێژووی زێرینی ئیسلامیان نووسی ،ئەوەبوو دەستی بچووکی بۆ پێغەمبەری خوا درێژ کرد لە ژێر تاریکی شەوا مویایەعەیان کرد لە بەیعەی عەقەبە ...

لەم ڕۆژەوە وای لی هات ئیسلام لە لای بە نرختر بێت لەم دڵەی کە لە نێوگیانیەتی ..

حەبیبی کوڕی زەید جەنگی بەدری نەبینی لەبەر ئەوەی ئەم کاتە زۆر منداڵ بوو ...هەروەها شەرەفی بەشدار بوونی جەنگی (ئوحد)یشی بۆنەنووسرا ، لە بەر ئەوەی دووبارە نەیدە توانی چەک هەڵبگرێت ...

... ئەمە لە هەموو جەنگەکان هەڵگری ئالای مەردایەتی و سەربەرزی بوو ... لاپەرەیەکی پڕشنگداری هەڵدایەوەو هەڵوێستی خۆبەکوشتدانی پێشکەش کرد .

بەشدار بوونی حەبیب لەم دیمانانەدا هەرچەند ئەم دیمانانە بەرزو گەورە بوون بەڵام لە ڕاستی دا هەر هەموویان خۆئامادەکردن بوون بۆ ئەم هەڵوێستە بەرزەی کە لە دوایی دا قسەی لێ دەکەین ، ئەم هەڵوێستە ی ویژدانت زۆر بە توندی دەلەرزێنێ و هەروەک ویژدانی ملیۆنەها مسوڵمانی هێنا لەرزین لە سەردەمی پێغەمبەرایەتی و تاکو ئەم ڕۆژەی ئێمە تێیدان ...

چیرۆک و داستانی ئەم کەڵە پیاوە سام وترس دەخاتە هەموو دڵێکەوە بە بڕوادارو بێ باوەڕەوە ، بۆ هەموو ئادەمیزادیش ڕوون دەبێتەوە کەوا ئیسلام چ جۆرە پیاوێک و موجاهیدێک دروست دەکات ، کاتێک ئیمان و بڕوایی لە دڵ و دەروونی چەسپا ،هیچ هێزێکی گەردوون ناتوانێت ئەم ئیمانە لە دڵ ودەروونی دەربهێنێت وڕێگای تاریکی پێ بگرێت ....

لە ساڵی حەفتەمی کۆچی پاش ئەوەی ئیسلام ڕەگ وڕیشەی داکوتاو هێزو توانای پەیدا کرد و کۆڵەگەکانی قایم بوون ، لە نیمچە دورگە عەرەب نوێنەرانی عەرەبەکان لە هەموو شوێنێک بارو بارگەیان تێک دەناو بەرەو (یثرب) بە ڕێ دەکەوتن بۆ دیداری پێغەمبەری خواو ﷺ ئاشکرا کردنی مسوڵمان بوونیان لە ژێر دەستیداو ، موبایەعەی بکەن لەسەر گوێ ڕایە ڵی ...

یەکێک لەم زنجیرە نوێنەرانە ،نوێنەری (بنی حنيفة )بوو لە بەرزانی یەکانی (نەجد ) هاتبوون ...

نوێنەرەکە حوشترەکانیان لە دەورو پشتی شاری پێغەمبەری خوا خست ، پیاوێکیان بەناوی (موسەیلەمەی کوڕی حەبیبی حەنەفی) بۆ پاسەوانی شت ومەکەکان بەجێهێشت ، ئەوە بوو نوێنەرەکە لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ مانەوەو ، مسوڵمان بوونی خۆیان و میللەتەکەیان لە ژێر دەستی پێغەمبەر ﷺ ئاشکرا کردو ، پێغەمبەری خواش ﷺ ڕێزێکی زۆری لە نوێنەرەکە ناو میواندارییەکی باشی کردن ، فەرمانی دا هەر یەکێکیان دیاری یەکی پێشکەش بکرێت هەروەها فەرمانی کرد دیاری پێشکەش بەو کەسەش بکرێت کە لە دوای خۆیان بە جێیان هێشتبوو بۆ پاسەوانی کەل وپەلەکانیان .

هێشتا نوێنەرەکە پێی لە خاکی (نەجد ) نەنابوو تاکو موسەیلەمەی کوڕی حەبیب لە ئیسلام هەڵگەڕایەوەو ، هەڵسا چووە ناو خەڵک وئاگاداری کردنەوە کەوا: موسەیلەمە پێغەمبەرێکە خوا ڕەوانەی کردووە بۆ (بنی حنيفة) هەروەک محمد کوڕی عبدالله ڕەوانە کرا بۆ قوڕەیش ....

ئەوە بوو نەتەوەکەی لە دەورەی کۆبوونەوە هانیان دا بۆ ئەمە بەزۆر مەبەستی جیاواز بەڵام گرنگترینیان مەبەستی نەتەوەگەری و هۆزپەرستی بوو ، تاکو یەکێک لە پیاوەکانی گووتی:

شایەدی دەدەم موحەممەد ڕاست دەکاو موسەیلەمە درۆ دەکات ،بەلاّم درۆزنی ڕەبیعەم لا خۆشەویستترە لە ڕاستگۆی (مضر)...(واتە هۆزی پێغەمبەرمان محمد ﷺ ):..
کاتێک بازووی موسەیلەمە بەهێزبوو و شوێن کەوتووانی زۆر بوون ، نامەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نووسی و تێیدا گووتی ...
لە موسەیلەمە پێغەمبەری خوا بۆ موحەممەد پێغەمبەری خوا ، سلام علیکم ...
پاشان من لەگەڵت هاوبەشم لەم پێغەمبەرایەتیە ، نیوەی زەوی بۆ ئێمەو نیوەی زەوی بۆ قورەیش ، بەلاّم قورەیش نەتەوەیەکن دەست درێژی دەکەن .. ئەم نامەی بە دوو کەس لە پیاوەکانی خۆی ڕەوانەکرد ،کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ نامەکەی خوێندنەوە بە دوو پیاوەکەی فەرمووی :
ئێوە چی دەڵێن ؟!
وەلامیان دایەوەو گووتیان :ئەوی دەڵێین کە ئەو دەیڵێت ... پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون..
بەلاّم سوێند بەخوا لەبەر ئەوەی پەیامنێر نابێت بکوژرێت دەنا ئێستا لە ملم دەدان ، پاشان نامەیەکی بۆ موسەیلەمەی ڕەوانەکرد تێیدا فەرمووی :
بسم الله الرحمن الرحيم
(من محمد رسول الله الى مسيلمة الكذاب ...
السلام على من اتبع الهدى ،اما بعد فأن الارض لله يورثها من يشاء من عباده والعاقبة للمتقين)
واتە : بەناوی خوای بەخشندە ومیهرەبان
(لە پێغەمبەری خوا موحەممەد بۆ موسەیلەمەی درۆزن ..
سەلامی خوا لەم کەسانەبێت کە ڕێگای هیدایەتیان گرتووە ، بەلاّم پاشان ئەم زەوییە موڵکی خوایە و دەیدا بەو بەندانەی کە ئارەزوو لی بێت وە چارەنوویش بۆ لەخوا ترسانە )
ئەم نامەی بە دوو پیاواندا ڕەوانە کرد.
ڕۆژبەرۆژ خراپە و خراپەکاری موسەیلەمەی درۆزن بلاّوەی دەکرد ، پێغەمبەری خوا ﷺ وای پێ چاک بوو کەوا نامەیەک بنێرێ بۆ ئەم درۆزنە بۆ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە لەم تاریکی یە ، هەروەها بۆ هەڵگری ئەم نامەیە قارەمانی داستانی ئەم جارەمانی دەست نیشان کرد ئەویش۔ حەبیبی کوڕی زەید۔ خوا لێی ڕازی بێت .... لەم ڕۆژگارەدا حەبیب گەنجێک بوو لەئەو پەری لاوێتی داو هەموو سیفەتەکانی گەنجایەتی پێوە دیار بوو و ، لە لوتکەی سەری تاکو قومپانی پێی ئیمان دایگرتبوو ..
حەبیبی کوڕی زەید۔ خوا لێی ڕازی بێت۔ فەرمانی پێغەمبەری خوای وەرگرت ﷺ بەبێ سێ ودوو بەبێ ترس و لەرز کەمتەرخەمی دۆڵ و کێوەکانی ئەم ناوچەیەی بڕی تاکو گەیشتە ئاوەدانی (بني حنيفة)لە بەرزاییەکانی نەجدو ، نامەکەی گەیاندە دەست

موسەیلەمە...

پاش ئەوەی کە نامەکەی وەرگرت و وەستا بوو نامەکەی خوێندرایەوە دڵ وسینەی پڕبوو لە ڕق وکین ، خراپەو ستەم لەسەر ڕووخساری ڕەشی زەردی ناشیرینی دەستی پێکرد ، فەرمانی دا حەبیبی کوڕی زەید زنجیر بکرێت و ، بۆ ڕۆژی دواتر بۆی بهێننەوە.

بۆ بەیانی موسەیلەمە بڕیاری دانیشتنی دا ، لە چەپ و ڕاستی گەورە شوێنکەوتووەکانی لە ستەمکاران وەستابوون ، ڕێگای دا خەڵکی دەرەوەش بێنە ژوورەوە ، پاشان فەرمانی دا حەبیبی کوڕی زەیدی بۆ بهێنن کەوا لەبەر قورسایی کۆت و زنجیرەکانی بە گرانی هەنگاوی دەهاوێشت ...

حەبیبی کوڕی زەید ـخواڵیـ ڕازیبێت ـوەستا لە نێو ئەم کۆمەڵە دەور دراوە داخ لە دڵە بەسەر بلندی و ، هەروەکو شێر چاوەکانی کردبوو دو بەرامبەریان وەستابوو ، دەتگووت ڕمێکی پۆڵایینە بەباشترین شێوە وەستاکەی بە ڕاست ڕێکی دروستی کردووە.

موسەیلەمە ڕووی تێکردوو گووتی:

شایەدی دەدەی موحەممەد پێغەمبەری خوایە ... ؟

حەبیب گووتی: بەڵێ شایەدی دەدەم موحەممەد پێغەمبەری خوایە....

موسەیلەمە گڕی ڕق وکینەی لێ هەڵساو گووتی :ـ شایەدی دەدەی من پێغەمبەری خوام ... ؟

حەبیب بە گاڵتەو گەپەوە گووتی : قورساییەک لەناو گوێیەکانم هەیە گوێم لێ نابێت چی دەڵێیت ..

ڕەنگی ڕووخساری موسەیلەمە گۆڕاو لێوەکانی لەرزین و بە جەلادەکانی گووت : پارچەیەک لە لەشی ببڕنەوە ...

جەلادەکە بە شمشێرەکەی تاوی دا حەبیب و پارچەیەک لە جەستەی بڕیەوە بەسەر زەوی دا غلۆر بۆوە..

پاشان موسەیلەمە بۆی گەڕاوە و هەمان پرسیاری لێکرد :

شایەدی دەدەی موحەممەد پێغەمبەری خوایە ؟

حەبیب گووتی :بەڵێ شایەدی دەدەم موحەممەد پێغەمبەری خوایە..

موسەیلەمە پێی گووت: شایەدی دەدەی من پێغەمبەری خوام ؟

حەبیب پێی گووت : پێم گووتی قورساییەک لە ناو گوێیە کانم هەیە گوێم لێ نابێت چی دەڵێیت .

موسەیلەمە فەرمانی کرد پارچەیەکی تریش لە جەستەی بکرێتەوە ئەوەبوو پارچەیەکی تریشیان لە جەستەی کردەوە ، تاکو ئەمیش غلۆر بۆوە تەنیشت پارچەکەی تر ، خەڵکەکە سەریان بڵند کردبۆوە تەماشای ئەم دیمەنەیان دەکرد ، سەریان سووڕمابوو لە نەخشەی زەید و خۆڕاگریەکەی ...

موسەیلەمە بەم جۆرە ماوە ، پرسیاری لـێ‌ی دەکردو ، جەلادەکە جەستەی دەبڕیەوە (حەبیب) یش دەیگووت :شایەدی دەدەم موحەممەد پێغەمبەری خوایە .. تاکو نیوەی جەستەیان بڕیەوەو پارچەکانی لە سەر زەوی پەرت وبلاوببۆوە ... نسۆکەی تریشی پارچەیەک بوو قسەی دەکرد...

پاشان گیانی پاکی بۆ لای پەروەردگار بەرز بۆوەو ،لەسەر لێوە پاکەکانی ناوی ئەو پێغەمبەرە دووبارە وسێ بارە دەبۆوە ئەو پێغەمبەرەی کەوا لە شەوی عەقەبە موبایەعەی کرد لە سەر شەهید بوون .. ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستەش موحەمەد بوو ﷺ.

هەوالی شەهید بوونی حەبیبی کوری زەید گەیشتە دایکی موجاهیدەی خۆشەویستی نەسیبەی مازنی هیچ شتێکی نەگووت بێجگە لەمە:ـ

لە پێناوی ئەم هەلوێستە زەیدم پەروەردەو گەورە کرد...

لەلایەنی خوا دەیهێلمەوە...

موبایەعەی دا بە پێغەمبەر ﷺ لە شەوی عەقەبە کاتێک بچووک بوو ... کاتێک گەورەش بوو بۆی بەوەفا بوو...

ئەگەر خودا دەرفەتم بدات بۆ موسەیلەمەی درۆزن وای لی دەکەم کچەکانی بۆی لە روخساری خۆیان بدەن ... زۆری نەبرد بۆ ئەوەی نەسیبە چاوەڕێ‌ی ئەم رۆژە بکات...

ئەوەبوو بانگدەری خەلیفەی ئیسلام ئیمامی ئەبوبەکر (خوالی‌ی رازی بێت) بانگی‌دا:

وەرن بۆ جەنگی پێغەمبەرزانی درۆزن موسەیلەمە...

مسولمانان مانەوە هەنگاویان دەژمارد بۆ گەیشتن بۆ موسەیلەمە ، لە نێو سوپاکەش نوسیبەی مازنی‌و کورەکەی عبداللەی کوری زەید بەشدار بوون ، لەرۆژی یەمامەی پرشنگدار بینیان نەسیبە وەکو شێرێکی بریندار ریزەکانی دوژمنی بری و هاواری کرد:

کوانێ دوژمنی خوا؟

دوژمنی خوام پێ نیشان بدەن...!!

پاش ئەوەی گەیشتە سەری بینی لەسەر زەوی کەوتووەو شمشێرەکانی مسولمانان خوێنی لـی دەتکێنەوە ، ئیتر دڵ و دەروونی خۆش بوو چاوی رۆن بۆوە.. ئایا بۆچی دڵی خۆش نەبێت؟

ئایا خوای گەورەو بەدەسەلات تۆڵەی کوڕە برو ادارە لە خواترسەکەی نەکردەوە کەوا بەم جۆرە کوڕە خۆشەویستەکەی شەهید کرد؟!

بەلێ... هەردوولا دونیایان بەجێهێشت گەیشتنەوە لای پەروەردگار بەلام چینێکیان بەرێ کەوتن بۆ بەهەشتی پان و بەرینی خوای گەورە گەیشتن بە پێغەمبەرو یاوەرەکانی...

چینەکەی تر بەریسوایی راکێشران لەسەرچاو بۆ دۆزەخی بلێسەداری هەرگیز نەبڕاوە گەیشتن بە هاوڕێکانیان نموونەی فیرعەون و ابو جەهل و رەجال و هاوچەشنەکانیان..

٣٦

# وەحشی کوڕی حەرب

بکوژی چاکترین ئادەمیزاد پێش
موسڵمان بوونی
بکوژی خراپترین ئادەمیزاد پاش
موسڵمان بوونی

«٣٦»

# وەحشی کوڕی حەرب

## بکوژی چاکترین ئادەمیزاد پێش مسوڵمان بوونی

## بکوژی خراپترین ئادەمیزاد پاش مسوڵمان بوونی

کێ بوو ئەو کەسەی دڵی پێغەمبەری خوای ﷺ خەفەتبار و بریندار کرد ، ئەو کاتەی لە جەنگی ئوحد مامی خۆشەویستی حەمزەی کوڕی عبد المطلب شەهیدکرا؟ پاشان دڵی مسوڵمان چاک بۆوە ئەوکاتەی لە جەنگی یەمامە موسەیلەمەی درۆزن کوژرا؟

ئەم پیاوە وەحشی کوڕی حەربی حەبەشی بوو ،ناسرابوو بە (ابو دسمە)....ئەمەش چیرۆکێکی خەمگین وخوێناویە ..با گوێ بدەینە خاوەنی ئەم کارەساتە دڵتەزێنە با بۆمان بگێڕێتەوە....

وەحشی دەڵێت : من منداڵێکی بەندەی (جوبەیری کوڕی موطعیم)بووم کەوا یەکێک بوو لە گەورە پیاوانی قورەیش. مامی ناوی (توعەیمە) بوو لە جەنگی بەدر بەدەستی حەمزەی کوڕی عبد المطلب کوژرا بوو ،جوبەیر زۆر خەمی بۆ خوارد ،سوێندی بە (لات و عوزا) خوارد تۆڵەی مامی بکاتەوە ،بکوژە کەی بکوژێتەوە... دەیویست هەڵێکی بۆ برەخسێ بۆ کوشتنی کوڕی عبد المطلب

کاتێکی زۆر پێ نەچوو تاکو قوڕەیش سوپایەکیان ڕێکخست و بڕیاری دەرچوونی ئوحدیان دا بۆ بن بڕکردنی مسوڵمانان و تۆڵەی کوژراوەکانی بەدر... پۆلەکانیان ڕێکخست و ،سوێند خۆرو هاوپەیمانەکانیان کۆکردەوەو پێویستی جەنگیان بۆ ئامادەکردو پاشان سەرۆکایەتی درا دەست (ابی سفیانی کوڕی حرب)....

ئەبو سوفیان وای بە چاک زانی چینێک لە ئافرەتانی قورەیش ببات لەگەڵ خۆی ئەوانەی باوک و نەوەو نزیکیان لە شەڕی بەدر کوژرا بوو ، بۆ ئەوەی هانی سوپاکە بدەن بۆ جەنگ و ، ڕێگا بگرن نەهێڵن پیاوەکان لە جەنگ هەڵبێن ، لە پێشەنگی ئەو ئافرەتانەی دەرچوون لەگەڵیان خێزانی ئەبو سوفیان هیندی کچی عوتبە بوو ... کەوا باوک ومام و برای هەر هەموویان کوژرا بوون لە جەنگی بەدر....

کاتێک بەڕێکەوتنی سوپا نزیک بۆوە ، جوبەیری کوڕی موطعیم ئاوڕی لێم دایەوەو گووتی :ئەی باوکی دەسمە دەتەوێت خۆت ڕزگار بکەیت لە کۆتی بەندایەتی؟

بێم گووت :من ئەم ڕێگیەم دەوێت ؟

گووتی : من ئەم ڕێگایەت نیشان دەدەم .

گووتم :ئەمە چۆن ؟

گووتی : ئەگەر حەمزەی کوڕی عبدالمطلب مامی (موحەممەد) ﷺ لە تۆڵەی توعەیمەی کوڕی عەدی مامم بکوژیت تۆ ئازادیت

پێم گووت : من ئەم کارە دەکەم...
وەحشی گووتی : من پیاوێکی حەبەشیم ڕم هاوێژێکی ئەوتۆم هەڵە ناکەم بۆ ئەو شوێنەی ڕمی بۆ دەهاوێم .. دەستم دا ڕمەکەم و بەگەڵ سوپاکە کەوتم لە کۆتایی کاروانەکە نزیک ئافرەتەکان دەڕۆیشتم من مەبەستم جەنگ نەبوو ..
من هەر کاتێک بەلای هیندی خێزانی ابی سوفیان دا تێدەپەڕیم ،ڕمەکەی منی دەبینی لە دەستم دەبریسکایەوە لە ژێر تیشکی خۆرو دەیگووت :
باوکی دەسەمە .. دلمان چاک بکەوە تا دلت چاک بکەینەوە ..
کاتێک گەیشتینە نوحد هەردوو سوپا بەیەک گەیشتن بۆی دەرچووم بەمەبەستی بەدوا گەڕان بەدوای حەمزەی کوڕی عبدالموتەلیب کەوا پێشتر نەماندە ناسی ،حەمزە لە هیچ کەس بزر نەدەبوو لەبەر ئەوەی پەڕی نەعامە (ووشتر مرخ) ی لە سەر سەری خۆی قایم دەکرد ئەمەش نیشانەی قارەمانیەتی بوو و هاوشانی خۆی داوا دەکرد هەروەک پالەوانە عەرەبەکانی ئەم کاتە دەیانکرد ...
زۆری پێ نەچوو تاکو بینیم حەمزە هەروەک وشترێکی بۆر بەدیارکەوت لە ناو کۆمەلێک جەنگاوەر کەوا بە شمشێرەکەی خەلکەکەی دەدوریەوە ،کەس نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێ بەرامبەری و بچەسپێت ...
دەمویست ئەم کاتە خۆمی بۆ ئامادە بکەم ، خۆم دەشاردەوە لە پەنا دار یان بەرد چاوەڕوانم دەکرد لێم نزیک بێتەوە سوار چاکێک لە سوارچاکانی قوڕەیش بە ناوی (سیباع کوڕی عبد العزی) لێی چووە پێشەوەو گووتی :شەڕم لەگەڵ بکە ئەی حەمزە ... شەڕم لەگەڵ بکە..!! حەمزە شەڕی لەگەڵ کردو گووتی : وەرە بۆلام ئەی کوڕی هاوبەش پەیداکەر وەرە بۆلام .. پاشان زۆری نەبرد لێدانێکی بۆکرد بەشمشێرەکەی و کەوتە سەر زەوی لە ژێردەستی لە ناو خوێنی خۆی گەوزا ... لەم کاتە وەستام بۆ حەمزە بە وەستانێک پێم باش بوو ، ڕمەکەم بۆ پێش وپاش هێناوبرد تاکو لێی دلنیا بووم بۆم هاوێشت لە خوارەوەی سکم دا لە نێو ڕانەکانی دەرچوو ...
بە گرانی دوو هەنگاوی بۆ هاوێشتم ئیتر نەیتوانی وکەوت ڕمەکە لەناو جەستەی مایەوە ، وازم هێنا لە ناو جەستەی تاکو دلێنا بووم کەوا مرد پاشان بۆی چووم و ڕمەکەم لە جەستەی دەرهێناو گەڕامەوە بۆ ناوخیوەتەکەو لێی دانیشتم ،پێویستم بە کەس نەما ، وە بۆ ئەوە حەمزەم کوشت تاکو لە بەندایەتی ئازاد بم ...
پاشان جەنگ گەرم بوو ، پەلامار و کشانەوە زۆر بوو ، بازنەی شەڕەکە پاش ئەوەی جەنگاوەرەکان بەرزایی چیاکەیان بە جێهێشت وفەرمانی پێغەمبەری خوا یان ﷺ شکاند بووە هۆی ئەوەی جەنگەکە بەسەر یاوەرەکانی پێغەمبەر ﷺ بشکێتەوە ، کوژراویان زۆر بوو ... لەم کاتە دا هیندی کچی عوتبە گەڕا بەسەر کوژراوی مسولمانان لەدواوەی چینێک ئافرەتی لە گەڵ بوو ئەتکی بەلاشەکان کرد ، سینگی شەق دەکردن و چاوی دەردەهێنان و لوت وگوێی دەبڕین ... پاشان گوارەو خەناوکەی لە

لوت و چاووگوێیەکان دروست دەکردو خۆی پێ دەرازاندەوە ، گوارە وخەناوکەکانی بۆ فڕێ دام و پێی گووتم :ئەمە بۆ تۆ . . .ئەمە بۆ تۆئەی باوکی دەسمە . . . بیان پارێزە ئەوانە بە نرخن . . . پاش ئەوەی جەنگ کۆتایی پێ هات لەگەڵ سوپاکە گەڕامەوە بۆ مەککە جوبەیری کوڕی موطعیم وەفایەکەی خۆی بەجێ هێنا کەوا بە لێنی پێ دابووم ئازادم بکات لە کۆتی بەندایەتی ،سوڕامەوە بە ئازادی . .

بەلام ئاینی موحەممەد ﷺ ڕۆژ بەڕۆژ لە گەشەکردن دابوو ، مسوڵمانەکان کاتژمێر لە دوای کاتژمێر لە پەرەسەندن دابوون ترس و لەرز دەروونی دا دەگرتم .لەسەر ئەم حاڵەم مامەوە ،تاکو موحەممەد ﷺ بەم سوپا گەورە ئازادکەرە چووە ناو مەککە لەم کاتەدا ڕێگای هەڵاتنم گرتەبەر بۆ (طائف) کەوا بە دوای هێمن و ئاسایش دا دەگەڕام بەلام ئەوەندەی نەبرد خەڵکی (طائف) تاکو ڕوویان کردە ئیسلام ، نوێنەرێکیان بەڕێ کرد بۆ گەیشتن بەموحەممەد ﷺ و ئاشکرا کردنی هاتنیان بۆ ناو ئیسلام .لەم کاتە هەموو شتێکم لە دەست چوو ، زەوی بەم فرەوانیەی لە پێش چاوم تەسک بۆوە و هەموو ڕێگایەکم لە پێش داخرا ،گووتم :خۆم بگەیەنمە شام ،یان یەمەن ،یاخود ولاتێکی تر.

سوێند بە خوا من لەم خەم و خەفەتەدابووم ،پیاوێک بەزەیی پێم هاتەوەو ووتی : چی دەکەیت ئەی وەحشی ، سوێند بە خوا موحەممەد ﷺ یەکێک ناکوژێت لە خەڵک بچێتە ناو ئاینەکەی و شایەتمانی هەق بدەیت . .

هەر کە گوێم لەم قسانەبوو تاکو دەرچووم ڕووم لە شاری (یثرب) کرد بەمەبەستی موحەممەد ﷺ. . . . .کاتێک گەیشتمە شار بەدوای دا گەڕام زانیم موحەممەد ﷺ لەمزگەوتە ، بە ترس و ئاگادارییەوە هەنگاوم بۆ هاوێشت وەستام لە سەر سەری و گووتم : اشهد ان لااله الا الله وان محمد عبده ورسوله...

کاتێک گوێی لە شەیاتمانی بوو سەری بەرزکردەوە تەماشای کردم کاتێک منی ناسی ڕووی لی وەرگێڕامەوەو فەرمووی : ئایا وەحشی تۆی ؟!!

گووتم : بەلێ ئەی پێغەمبەری خوا . . .

فەرمووی : دانیشە وبۆم بگێڕەوە چۆن حەمزەت کوشت ، دانیشتم و بۆم گێڕایەوە هەواڵەکەم پێ ڕاگەیاند ، پاش ئەوەی لە قسەکانم تەواو بووم ڕووی لی وەر گێڕام فەرمووی :

چیت کرد ئەی وەحشی ڕووت لەبەرامبەرم بزر بکە لەم ڕۆژەوە نەمبینیت ، ئەگەر یاوەرەکان لەبەرامبەری دانیشتبان جێگایەکم لە پشتەوەی دەگرت .

پاشان وەحشی لە قسەکانی بەردەوام دەبێ ودەڵێت : لەگەڵ ئەوەی دەمزانی ئیسلام گوناهەکانی پاشە خۆی رە ش دەکاتەوە ، لەوێژدانم مایەوە هەستم دەکرد تاوانێکی زۆر گەورە و کارەساتێکی یەکجار گەورەم بەسەر ئیسلام ومسوڵمانان داهێناوە ، دەگەڕام بە دوای دەرفەتێک بۆ ئەوەی گوناهەکانی پاشە خۆم بسڕمەوە . . .

کاتێک پێغەمبەر ﷺ گەیشت بە بارەگای خوا خەلافەتی مسوڵمانان درا دەست

هاوریٚ یەکەی ابو بکر ، (بنی حنیفە) ئەوەی موسەیلەمەی درۆزن هەڵگەڕانەوە ، وە بۆ گێڕانەوەی (بنی حنیفە) بۆ ئایینی خوا... لە دڵی خۆم دا گووتم : سوێند بە خوا ئەمەیان دەرفەتە ئەی وەحشی هەڵیقۆزەوە .... لی ئەگەرێیت لە دەستت بچێت ...

پاشان لەگەڵ سوپای مسولمانان دەرچووم ئەم ڕمەی سەروەری شەهیدان (حەمزەی کوڕی عبدالموتەلیب)م پێ کوشت لەگەڵ خۆم هەڵم گرت ، وام دانا لە دەروونی خۆم بەم ڕمە موسەیلەمەی پێ بکوژم یاخود سەر بکەوم بە شەهادەت پاش ئەوەی مسولمانان پەلاماری موسەیلەمە و سوپا کەیان دا لە باخچەی مردن تێک گیران لەگەڵ دوژمنانی خوا ، چاوم دەگێڕا لە موسەیلەمە ،بینیم بە پێوە وەستاوە شمشێرەکەی لە دەستە ، بینیم پیاوێک لە (ئەنصارەکان) چاوی لی دەگێڕی چۆن من چاوم لی ی دەگێڕا : هەردووکمان دەمانویست بیکوژین ..

پاش ئەوەی بۆی وەستام بە وەستانێک لی ی دڵنیابووم ،ڕمەکەم بۆ پاش وپێشر هێنام وبردم تاکو ڕاستە ڕێبوو لە ناو دەستم بۆم هاوێشت و پێ ی کەوت .. لەم ساتەی من ڕمەکەم بۆ موسەیلەمە هاوێشت ئەنصاریەکیش پەلاماریدا شمشێرێکی لی دا ... تەنها خوا دەزانێت کامەمان کوشتمان ...ئەگەر من کوشتبم ، ئەوا هەروەک چاکترین ئادەمیزادم لە دوای موحەممەد کوشت .. هەروەها خراپترین ئادەمیزادیشم کوشت....

٣٧

# عبداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول

**موجاهیدێك دژی باوکی**

﴿٣٧﴾

# عبداللەی كوڕی عبداللەی كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول

## موجاهیدێك دژی باوكی

بەڕاستی بـەندەكانی خوا دەزانـن بـیرو بـاوەڕ لـە سەرووی هەموو شتێكە ، بڕوادار هەموو شتێكی بەنرخ و خۆشەویست لـە پێناوی بەخت دەكـات ، لەبەر ئەوەی مـافی خـوای گەورەیـەو ، خـۆی دروسـت كـارو ڕۆژی دەرە ... هـەر خـۆی بـەرز كـەرەوەو نـزم كەرەوەیەو پادشای هەموو سامانێكە ، هەموو شتێكیش بۆ لای ئەو دەگەڕێتەوە ...

كاتێك لێپرسینەوەی گەورەی پەروەردگار ڕۆژی دوایی دەست پیێ دەكات ، مرۆڤ هەموو یادگاریەک لە بیر دەكات (یوم یفر المرء من أخیه ، وأمه وأبیه ، وصاحبته وبنیه ، لكل أمرئ منهم یومئذ شأن یغنیه) ..بەڵێ بیروباوەڕی ڕاست و پتەو وا لـە خاوەنەكەی دەكات لە پێناویدا هەموو شتێک لە یاد بكات و ، هەموو شتێكی بە نرخ و خۆشەویست بكـات بـە قوربـانی ، بۆ سەر كەوتنی ئەم مەبەستە پیرۆزە ....لێرەدا دەبینین یاوەرەكـانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دژایـەتی دایـک و باوكیـان و نزیـک و خۆشەویستەكانیان دەكەن لـە پێناوی خـوای گـەورە ، لەبەر ئەوەی هەق هەموو كـات بەرزەو هیچ شتێک لە هەق بەرزتر نابێتەوە ......

بۆ نموونە ( أبو عبیده كوڕی جراح ) كاتێک بەشـداری جەنگی بـەدر دەكـات و ، باوكی هاوبـەش پەیداكـەری دەكوژێت ، پاش ئەوەی باوكایـەتی و كوڕایـەتی لـە یـاددەچێت ، تەنهاو تەنها خوای گەورەو ئیسلامی لـەیاد بوو و پێویست بوو ناهەق لابچێت وهەق جێگیر ببێت ، ئنجا بەهەر ڕێگایەكی ڕاست ڕێگای تێ بچێت ...

لێرەدا قورئانی پیرۆز نەخشەی ئەم ڕێبـازەی بـۆ كێشـاوین سەبارەت بـەم بابەتـە ، لـە سورەتی (التوبة): (یا أیها الذین آمنوا لاتتخذوا آباءكم واخوانكم أولیاء ان استحبوا الكفر على الإیمان ، ومن یتولهم منكم فأولئك هم الظالمون ، قل ان كان آباؤكم وأبناؤكم وإخوانكم وأزواجكم وعشیرتكم وأموال اقترفتموها وتجارة تخشون كسادها ومساكن ترضونها أحب إلیكم من الله ورسوله وجهاد في سبیله فتربصوا حتى یأتي الله بأمره ، والله لایهدی القوم الفاسقین) ...

واتە : ئەی ئەوانەی باوەڕیتان هێناوە باوک و براتان مەكەن بە دۆست و گەورە ئەگەر بێ باوەڕیان بەسەر باوەڕداری هەڵبژارد ، هەر یەكێک لە ئێوە ئەم كارە بكـات ئەوا ئەوانە ستەمكارن ، ئـەی موحەمـەد پێیـان بڵـێ ئەگـەر بـاوک و منداڵـەكانتان و براكانتـان و خێزانـەكانتان و هۆزتـان و ئـەو ماڵـەی قـازانجی لـێ دەكـەنو ئـەو بازرگانیـەی دەترسـن بمێنێتـەوەو ئـەو خانووبـەرەی پـێی ڕازیـن ، خۆشەویستر بـوو لـە لاتـان لـە خـواو پێغەمبەروجیهاد لە پێناوی خوا چاوەڕێ بكەن تاكو خوا فەرمانی خۆی دەنێری ، خواش

هیدایەتی میللەتی ڕێ بزر کردوو نادات ....
لە سورەتی (المجادلة) دەفەرموویت :-[ لاتجد قوما" یؤمنون بالله و الیوم الأخر یوادون من حاد الله ورسوله ، ولو كانوا آباءهم وأبناءهم أو إخوانهم أو عشيرتهم أولئك كتب في قلوبهم الإيمان وأيدهم بروح منه ، ويدخلهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ، رضي الله عنهم ورضوا عنه أولئك حزب الله ألا إن حزب الله هم المفلحون] .
واتە میللەتێک نابینیت بڕوایان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێت خۆشەویستی و دۆستایەتی کەسێک بکەن دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن ، ئەگەر ئەوانە باوک و نەوەو براو هۆزی بن ، ئەمانە خودای گەورە ئیمان و ڕووناکی خۆی لە دڵ و دەروونیان چەسپاندووەو ، دەیانباتە چەند بەهەشتێک ڕووباریان بە نێودا تێدەپەڕێ بە یەکجاری لە ناویدا دەمێننەوە ، خوا لێیان ڕازی یەو ئەوانیش لەخوا ڕازین ، ئەمانە کۆمەڵی خوان بەڕاستی هەر کۆمەڵی خوا سەرکەوتوون !!] .
ئەوەی جێگای سەر سوڕمانە لە کارەکانی خوای گەورە دروست کراوەکانی کاتێک ئیمانی پرشنگداری سەری هەڵدا ئەوا تاریکی و گومرایی ناهێڵێت ، کاتێک ئیمان ڕۆشن بۆوەو بەرز بۆوە ئەوا گەورەتر دەبێت لەسەر هەموو پەیوەندیەک و خزمایەتیەک ئەمەش نموونەی باوکێک و کوڕێکە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی ، بەبێ ئەندازە جیاوازن لەگەڵ یەکتردا ، باوکەکە وێنەیەکی پیسی گومرایی و دووڕوویی یە ، هەرچی کوڕەکەیە نموونەیەکی پاکی ئیمان و خووڕەوشتی بەرزە ، ئەمانە لەیەک خێزانن ، بەڵکو ئەمانە باوک و کوڕن ، هەردووکیان ناویان (عبدالله) یە ، بەلأم لەناوەڕۆک دا زۆر لە یەک دوورن یەکەمیان تەنها ناوەکەیە بەلأم ئەوی تریان تاوو ناوەرۆکە ، هەر لەبەر ئەمەیە دەبینین پێغەمبەری خوا ناوی کوڕەکە کەوا (الحباب) ە کاتێک موسڵمان دەبێت پێغەمبەر ناوی لی دەنێت (عبدالله) بۆ ڕاست کردنەوەی ناوی باوکە دووڕووەکەی ، هەروەها لەهەموو کات و سەردەمێکدا دەبینین سەرۆک حیزبە عیلمانیەکان ناوی گەورەی ئیسلامی لە خۆیان دەنێن بەلأم لەناوەڕۆکدا دوو ڕوون و دوژمنی ئیسلام و مسولمانانن و نۆکەرو بەکرێ گیراوی جولەکەو خاچ پەرستەکانن ..
(عبدالله) ی باوکی ناوی عبداللەی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بوو ، کەوا گەورەی دوو ڕووەکان بوو و ببوو بە ئەشکەوتێک بۆ ئەوەی دوو ڕووەکانی مەدینە پەنای بۆ ببەن ، هەروەها لە ژێر پەردەوە تانەو تە شەریان لە پێغەمبەرو مسولمانان دەدا ، لە جەنگی ئوحدیش دەیانویست مسوڵمانان ڕیسوا بکەن کاتێک بە سێیەکی سووپا گەڕانەوە بەپاساوی درۆو دەلەسەو ، لەژێرەوەش پەیوەندیان دەکرد بە جولەکەکان و پیلانی نهێنیان دژی مسوڵمانان دادەناو ، هەر ئەم پیاوە بوو دەیگووتە جولەکەکانی (بني النضير) ی پەیمان شکێن :-[ ئێمە لەگەڵ ئێوەین ، ئەگەر شەڕتان کرد شەڕتان لەگەڵ دەکەین ، ئەگەر دەرچوون لەگەڵتان دەردەچین] .. دەربارەی عائیشەی دایکی

مسولمانان ـ خوا لی‌ی رازی بێت ـ زمان درێژیان ده‌کردو ده‌رباره‌ی قسه‌ی ناشیرینیان ده‌کرد . به‌لام (عبدالله) ی کوڕی ناوی عبداللەی کوڕی عبداللەی کوڕی ئوبه‌ی کوڕی سه‌لول بوو :ـ یاوه‌ری ئه‌نصاری به‌ڕێز ، یه‌کێک بوو له‌وانه‌ی نووسه‌ری نیگایه‌کانی پێغه‌مبه‌ر بوو ، یه‌کێک بوو له‌ پیاوه‌ چاکه‌کانی مسولمانان و زاناکانیان و ، جه‌نگی به‌درو جه‌نگی ئوحد و ، هه‌موو دیمانه‌کانی له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بینی ، له‌هه‌ندێک له‌ گه‌شته‌کانی پێغه‌مبه‌ر له‌ دوای خۆی به‌جێده‌هێشت . . .

(عبدالله) زۆر هه‌ولی ده‌دا و ئه‌وه‌نده‌ی له‌ توانای دا هه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی باوکه‌ گومرایه‌که‌ی بگێڕێته‌وه‌ چاکی بکات ، تاکو له‌ هه‌ندێک له‌ ڕیوایه‌تان ده‌گێڕنه‌وه‌ ئه‌م کوڕه‌ بڕواداره‌ ڕاسته‌ جارێکیان له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ دانیشتبوو ، پێغه‌مبه‌ر ده‌یویست ئاو بخواته‌وه‌ ، (عبدالله) پی‌ی گووت :[ تووخودا ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ، ئه‌گه‌ر ئه‌م به‌رماوه‌ی تۆ ده‌مینێته‌وه‌ باوکم بیخواته‌وه‌ به‌ڵکو خودا دلی پاک بکاته‌وه‌] پێغه‌مبه‌ریش هه‌ندێک له‌به‌ر ماوه‌ی مایه‌وه‌ ،ئه‌م کوڕه‌ هه‌ڵیگرت و بردی بۆ باوکی ، باوکی لی‌ی پرسی :ـ ئه‌مه‌ چی‌یه‌ ؟ کوڕه‌که‌ی پی‌ی گووت :ـ ئه‌مه‌ به‌ر ماوه‌یه‌که‌ له‌ئاوی پێغه‌مبه‌ر ﷺ هێناومه‌ بیخۆیته‌وه‌ به‌ڵکو خوا دلت پاک بکاته‌وه‌ . . . .باوکی دووڕوو وه‌لامی کوڕه‌که‌ی دایه‌وه‌ به‌قسه‌یه‌کی ناشیرین :ـ باشتر نه‌بوو میزی دایکتم بۆ بهێنی ئه‌و له‌ ئه‌م پاکتر نیه‌ ؟ !!] کوڕه‌ بڕواداره‌که‌ زۆر تووڕه‌ بوو له‌ باوکی دوو ڕووی کاتێک ئه‌مه‌ی گوێ لی بوو ، چووه‌ بۆ لای پێغه‌مبه‌ر ڕێگای بدا بچێت باوکی بکوژێت ،به‌لام پێغه‌مبه‌ری به‌ڕێزو پاک پی‌ی فه‌رموو :ـ به‌ڵکو به‌زه‌ییت پی‌ی بێته‌وه‌و چاکه‌ی له‌گه‌ڵ بکه‌ . . . .

عبدالله باوکی دوو ڕوو زمان درێژی کرد له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا له‌ جه‌نگی [ بنی المصطلق] ـ ئه‌م جه‌نگه‌ پێیان ده‌گووت جه‌نگی (المريسيع) له‌سالی شه‌شه‌می کۆچی بۆهان دانی خه‌ڵکه‌که‌ له‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا ، گووتی :[لئن رجعنا الى المدينة ليخرجن الأعز منها الأذل ...] .. واته‌ : با بگه‌ڕێینه‌وه‌ مه‌دینه‌ پیاوی به‌ عیززه‌ت پیاوی سووک ڕیسوا ده‌کات . . . .

زه‌یدی کوڕی ئه‌رقه‌م ئه‌م قسه‌یه‌ی به‌ پێغه‌مبه‌ر گه‌یاند ، دوو ڕووی نه‌فره‌ت لێکراو ئینکاری ئه‌م کاره‌ی کرد ، قورئانی پیرۆزی بۆ هاته‌ خواره‌وه‌ ئه‌م کاره‌ی له‌ سوره‌تی (المنافقون) ئاشکرا کرد ، لێره‌دا ئیمامی عومه‌ر به‌ پێغه‌مبه‌ری گووت :

ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ، فه‌رمان به‌ (عبادی کوڕی بیشر) بده‌ بچێت بیکوژێت . . !! پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی : ئه‌مه‌ چۆن ده‌بێ ئه‌ی عومه‌ر له‌ دواییدا خه‌ڵک باس بکه‌ن بلێن موحه‌ممه‌د یاوه‌ری خۆی کوشت ؟ [ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی عبداللەی باوک خه‌ڵک وای ده‌زانی تا ئه‌م کاته‌ یه‌کێکه‌ له‌ مسولمانان ] . . . .

هه‌ندێک یاوه‌ر سه‌باره‌ت به‌م دوو ڕووه‌ داخ له‌ دڵه‌ هاتنه‌ لای پێغه‌مبه‌رو پێیان گووت :[ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا لی‌ی ببووره‌ ، ئه‌م پیاوه‌ وای ده‌زانی تاجی پادشایه‌تی ئه‌م شاره‌ له‌سه‌ری خۆی ده‌نێت ، به‌لام کاتێک ئیسلام هات تێ هه‌لدرا ] . .

واریوایەتیش دەکەن (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر ) ئەو بوو بە پێغەمبەری گووت : [ ئەی پێغەمبەری خوا ، بەزەییت پێیدا بێتەوە ، سوێند بەخوا خوا تۆی هێنا بۆ ئەم شوبهە میللەتەکەی مرواریان بۆ دەهوناندەوە بۆ ئەوەی لە ملی بکەن ، وا دەزانێت تۆ هاتووی دەستت بەسەر مولکی ئەو داگرتووە ] هەروەک بڵێیت خوای گەورە ئەم هەڵوێستەی ویستووە لەبەر حیکمەتێکی گەورە ، ئەوەش ئەمەیە بۆ ئەوەی گیانی جیهادی بێ وێنەی عبداللە کوڕی بڕوادار بەدیار بێخێت ، بەرامبەر عبداللە باوکی دوو ڕوو ، کاتێک باوکی ویستی بگەڕێتەوە ناو مەدینە کوڕەکەی بەرامبەری وەستاو پێ گووت :ـ[ بوەستە ، سوێند بە خوا نایەیتە ناو مەدینە تاکو نەڵێیت منم ڕیسواو ، پێغەمبەری خوا بە عیززەتە ] . . !!

باوکی دوو دڵی کرد لە گووتنی ئەم ووشەیە ، کوڕەکەی پێ ی گووت : ( سوێند بە خوا ئەگەر نەیەڵێیت خواو پێغەمبەر بە عیززەتن لە ملت دەدەم باوکەکە بە ترسەوە بە کوڕەکەی گووت :ـ[ خاکت بەسەر ، بەڕاستیتە وا دەکەیت ؟ کوڕەکە وەڵامی دایەوە : بەڵێ .

باوکی دوو ڕوو مل کەچ بوو و ڕیسوا بوو ، دانی بە دەروونی خۆی هێناو ، بە زمان بڕیاری عیززەتی خواو پێغەمبەری دا :ـ[ ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين ، ولكن المنافقين لايعلمون] .

باوکی دوو ڕوو دەیویست پاش ئەم دان هێنانە ڕیسوایی یە بێتەوە ناو مەدینە ، دووبارە ڕێگای لی گرت و ، پێ ی گووت :ـ ( بوەستە ، سوێند بەخوا نایەتیە ژوورەوە تاکو پێغەمبەری خوا ڕێگات پێ نەدات )

پێغەمبەر ﷺ بەم هەڵوێستەی زانی و ، ڕێگای پێ داو ، کوڕەکەش ڕێگای باوکی دا

پاشان عبداللە ی کوڕی گەیشتە تڕۆپکی گیانی جیهاد کاتێک سوور بوو لەسەر کوشتنی باوکی دووڕووی بێ باوەڕی ،ئەمەش لە پێناوی بیروباوەرەکەی بوو بەهەموو نرخ و خۆشەویستەکەی ، وا بلاوبۆوە لە نێو مسوڵمانان پێغەمبەر ﷺ ئەم دووڕووە سپلەیە دەکوژێت ، عبداللە کوڕی بڕواداری بەوەی زانی ، ئایا چی کرد ؟

عبداللەی کوڕی بڕواداری لە کاتێکدا نێچیرێکی خەفەتباری کۆمەڵێک لە سۆز بوو ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەم سۆزەش سۆزی باوکایەتی بوو کە پێوەی بەسترا بۆوە ، لێرەدا سۆزی ئیمان و عەقیدەش لە سەرووی ئەو پێوەی بەسترا بۆوە ، جێگای پێغەمبەریش لە لای ، دایک و باوکی بە قوربان دەکرد . . . لەبەر ئەوە نەوەک کاری تۆڵە سەندنەوەی بەبیردا بێتەوە لە دوا ڕۆژدا بۆ ئەو کەسەی هەڵسێت بە کوشتنی باوکی ، ئەوا لەم کاتەدا دەبێتە هۆی برایەکی مسوڵمانی خۆی بکوژێت ئەم کاتە ئاگری دۆزەخ دەیگرێتەوە . . . .

عبداللەی بڕوادار چووە لای پێغەمبەر ﷺ پێ ی گووت :ـ ئەی پێغەمبەری خوا وام پێ

گەیشتووە تۆ دەتەوێت عبدالله کوڕی ئوبەی باوکم بکوژێت ، ئەگەر دەتەوێت ئەمە بکەیت فەرمان بدە سەریت بۆ بێنم ، سوێند بەخوا خەزرەج دەزانێت هیچ کەسێک لەناویان دا نەبووە وەکو من بۆ باوکم گوێ ڕایەڵ بێت ، لەوە دەترسم فەرمان بدەی بە یەکێک بێجگە لەمن بیکوژێت ، دەروونم نەیەڵێت تەماشای بکوژی باوکم بکەم و بە پێش چاوم هاتو چۆ بکات ، پاشان بیکوژمەوە ، مسوڵمانێک بکوژم بۆ بێ باوەڕێک ، پێی بچمە ناو ئاگر !.....

بەم جۆرە (عبدالله) ی بڕوادار گفتوگۆ دەکات ئامادە بوونی خۆی بە تەواوی نیشان دەدات بۆ هەڵسان بەم کارە جیهادی یە ، ملی باوکی ببڕێتەوە لە پێناوی خواو بیروباوەڕەکەی ....

ئایا دەبێت وەڵامی پێغەمبەری داناو چاکە خوازی چی بێت بۆ عبدالله ؟!

بەڵێ بە (عبدالله) ی فەرموو :.[ بەڵکو بەزەییت پێیدا بێتەوەو تاکو لە گەڵمانە چاکەی لەگەڵ بکە ] ... پاشان پێی فەرموو :[ چاکەی لەگەڵ بکەو ، بێجگە لە چاکە هیچی تر لە تۆ نەبینێت ) ) !!

بەم گیانە جیهادی یە بەرزەی (عبدالله) و ، ئەم لێبووردنە پێغەمبەریە پڕشنگدارە ، (عبدالله) ی باوکی ڕیسوا لی بووردراو لە نێوان دوو بەردە ئاش مایەوە ، لە پاش ئەمە نەیتوانی سەری بەرزکاتەوە ، یاخود کلکی ئاژاوە بابداو ، یان قسەیەکی خراپ بکات ، بە سووکی وڕیسوایی ژیانی بردەسەر ، تا ئەستێرەی کوڕی بڕواداری گەشایەوە ، بە دڵسۆزی و موجاهیدی مایەوە لە ڕێگای خوا ، تاکو بەبەخششی شەهادەت مەدالیەی سەرکەوتنی پێ بەخشرا لە جەنگی (یەمامە) لەساڵی دوازدەی کۆچی خوا لیی ڕازی بێت ....

ئیمام سوهەیلی لەپەڕاوی (الروض الأنف) بۆمان دەگێڕێتەوە دەربارەی مەسەلەی عبدالله بۆ کوشتنی باوکی ، کەوا بیروباوەڕی بە گەورە زانیوە لەسەر مافی باوکایەتی ئاماژە بۆ (عبدالله) ی کوڕی بڕوادار دەکاو دەڵێت :.[عبداللەی کوڕی ڕوخسەتی لە پێغەمبەر وەرگرت بۆ کوشتنی باوکی ، وەئەمە بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕوونی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی یە ، لەم سەردەمەدا عەرەب لەهەموو کەس زیاتر دەمارگیریان هەبووە ، کاتێک ئیمان گەیشتە لایان و ، ڕوناکی ئیسلام لە دڵیان چەسپا ، تاکو وای لی هات پیاو دەستی بچێتە کوشتنی باوک و کوڕی ، بۆ نزیک بوونەوە لەخواو لە پێغەمبەرەکەی ، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ لە بنەماڵە زۆر لەم خەڵکە دوور بوو ...

ئەوەبوو ئیسلام بۆ یەکەمجار گەیشتە خەڵکە دوورەکەو ، مسوڵمان بوونی میللەت و هۆزەکەی بە دوا کەوت ، ئەمەش تەنها لەبەر حیکمەتێکی مەزن بوو ، ئەگەر خزم و نزیکەکانی زووتر ڕوویان لە ئیمان بکردبایە دەیانگووت:. ئەمانە میللەتێکن شانازی بە پیاوێکی خۆیان دەکەن و دەمارگیریان بۆی هەیە ، کاتێک خەڵکە دوورەکە ڕوویان

تێکردو شەڕیان کرد لەگەڵ خزم و نزیکەکانی و دوژمنەکانی ، زانرا ئەمە تێبینی یەکی ڕاستەو ، ئیسلام جێگاو شوێنی خۆی گرت لە نێو دڵەکان و ،ترسی خوا هەموو ئەو سیفەتانەی کە جێگای خۆی کردبۆوە لە نێو دڵیان لە ڕەوشتی جاهیلی ڕامالّدراو ، هیچ شتێکیش نەیدەتوانی لایببات تەنها ئەو کەسە نەبێت کە دروستی کردبوون ، ئەم خودایەش بە توانایە لەهەر شتێک مەبەستی بێت ] ....

بەم ئیمانە پتەوەی جێگیر ببوو لە نێو دەروون و گیانەکان ، توانرا زاڵ بن بەسەر بیرو ڕاو دڵەکان ، کۆڵەگەی گومڕایی دەستی بە لەرزین کرد بەرامبەر پۆلەکانی ئیمان و ، بەم خووە جیهادی یە زاڵە بەسەر هەست و بیرو باوەردا ، کۆمەڵی بڕوادار توانیان پارێزگاری لە بیرو باوەڕو ئیمانە کەیان بکەن ، سەرکەوتنەکانیش هەر هەمووی بە ویستی خوای بەدەسەلات و دانابوو !

٣٨

# عەبادی کوڕی بیشر

سێ کەس لە ئەنصاری یەکان کەس
نەیدەتوانی شان لە شانیان بدات لە
گەورەیی
سەعدی کوڕی موعاذ و
عەبادی کوڕی بیشر و
ئوسەیدی کوڕی حوضەیر

﴿٣٨﴾

# عەبادی کوڕی بیشر

## سێ کەس لە ئەنصاری‌یەکان کەس نەیدەتوانی شان لە شانیان بدات لە گەورەیی

## سەعدی کوڕی موعاذ وعەبادی کوڕی بیشر و ئوسەیدی کوڕی حوضەیر

عەبادی کوڕی بیشر ناوێکی ڕووناک و پرشنگدار ە لە مێژووی بانگهێشتنی ئیسلام ... ئەگەر بەدوای گەڕابای لەنێو یاوەرەکان دەتبینیەوە پیاوێکی لەخوا ترس و پاک و شەونخوونی بەخوێندنەوەی قورئانی پیرۆز .... وە ئەگەر داوات بکردبایە لە نێو قارەمانە گەنجەکان دەتبینیەوە بەگەنجێکی ئازاو موجاهیدێکی جەنگاوەر بۆ پارێزگاری لە ئایینی خواو بەرزکردنەوەی ووشەی خوا.... وەئەگەر بەدوای بگەڕابای لە نێو لێپسراوەکان دەتبینی پیاوێکی بەهێزی دەستپاک لەسەر موڵکی موسلمانان....
تاکو عائیشە دەربارەی عەبادو دوو کەسی تر لە میللەتەکەی دەیفەرموو:
سێ کەس لە ئەنصارەکان کەس نەیتوانیوە شان لە شانیان بدات لە گەورەیی لە هەموو (بنی عبدالاشهل):-
سەعدی کوڕی معاذو، ئوسەیدی کوڕی حوضەیرو، عەبادی کوڕی بیشر ...
کاتێک یەکەم ڕووناکی ئیسلام لە ئاسۆی (یثرب) بە دیار کەوت و بریسکایەوە عباد کوڕی بیشری ئەشهەلی یەکەم کەس ئەم هیدایەتەی بەرکەوت، گەنجێک بوو لەوپەڕی لاوێتی، بازوو بەهێز، لەنێوچوانی نیشانەی پاکی‌و خاوێنی پێوە دیار بوو، و لەهەڵس کەوتی سیفەتی زیرەکی‌و گرانی ڕەنگی دەدایەوە، لەگەل ئەوەی لەم کاتەدا تەمەنی پیرۆزی لاویەتی لە بیست وپێنج ساڵ تێپەری نەکردبوو....
لەگەل بانگهێژی مەکی‌و نوێنەری پێغەمبەری خوا ﷺ موصعەبی کوری عومەیر کۆبۆوە، ئەوەبوو زۆر بەپەلەوخێرایی، ئیمان هەردوو دڵە پاکەکەی لە یەکتر نزیک کردنەوەو کردینی بە برا، سیفاتی بەرزو خوورەوشتی جوان هەردوو دەروونی یەک کردن....
گوێی گرت لە موصعەبی کوری عومەیر کاتێک قورئانی پیرۆزی بەدەنگە خۆش و پڕ بە سۆزەکەی بە تەرتیل دەخوێندەوە دەنگە بەجۆش خرۆشەکانی بەند بوو بە قسەکانی خوای گەورەو، لە قولایی دڵی جێگایەکی گەورەی گرتبوو، عەباد وای لی‌هات هەموو کاتێکی بێ ئیشی، قورئان خوێندنی دووبارە دەکردەوە لە شەوو لە ڕۆژو، لە جێگیر بوون و گەشت کردنی، تاکو لە ناو یاوەرە بەرێزەکانی ناسرا بە پێشەواو هاوڕێی

قورئان...
شەوێک لە شەوان پێغەمبەری خوا ﷺ شەونخوونی دەکرد لە ماڵی عائیشە (خوا لێی رازی بێت) کەوا ماڵیان بە مزگەوتەوە نووسابوو، گوێی لە دەنگی عەبادی کوڕی بیشر بوو قورئانی بە دەنگێکی تەڕو خۆشەوە دەخوێندەوە دەتگووت (جیبریل) هێناوەتە خوارەوە بۆ سەر دڵی، فەرمووی: ئەی عائیشە: ئەمە دەنگی عەبادی کوڕی بیشرە؟!
عائیشە گووتی: بەڵی ئەی پێغەمبەری خوا...
پێغەمبەر فەرمووی:ـ اللهم اغفر له ... خودایە لە عەباد خۆش ببە...
عەبادی کوڕی بشر هەموو دیمانەکانی لەگەڵ پێغەمبەر خوا ﷺ بینیوە، لە هەموو دیمانەکانیش هەڵوێستێکی وای هەبووە شایەنی هەڵگری قورئان بووە.. بۆ نموونە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست لە جەنگی (ذات الرقاع) بگەڕێتەوە فەرمانی دا بە موجاهیدان لە دۆڵێک لە دۆڵەکان دابەزن بۆ ئەوەی شەویان تیا بەسەر بەرن...
یەکێک لە موجاهیدان ئافرەتێکی هاوبەش پەیداکەرەکانی ئەوکاتە، پیاوەکەی لەم شوێنە نابێت بەدیل دەگرێ.. لەکاتی جەنگ...، کاتێک مێردی ئافرەتەکە دەگەڕێتەوە .. ئافرەتەکەی نابینێتەوە.. سوێند دەخوات بەلات و عوزا بگات بە موحەممەدو یاوەرەکانی نەگەڕێتەوە تاکو خوێنیان نەرێژێت...
کاتێک موجاهیدەکان گەیشتنە دۆڵێک و بارەکانیان خست پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:ـ کێ لەم شەوەدا پاسەوانیمان لێ دەکات؟
عەبادی کوری بیشر و عەماری کوری یاسر هەڵسانەوە گووتیان: ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا، کاتێک موجاهیدەکان گەیشتنە شاری مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووکیان کردبوون بەبرا...
کاتێک رۆیشتن بۆ دەمی دۆڵەکە عەبادی کوڕی بیشر گووتی بە براکەی عەماری کوری یاسر: دەتەوێت لە کام بەش لە بەشەکانی شەو بخەویت: لە سەرەتا یان لە کۆتایی؟
عەمار گووتی: من لەسەرەتای شەو دەخەوم، لەنزیک عەباد پاڵ کەوت.
ئەم شەوە شەوێکی سامال و هێمن و بێدەنگ بوو، ئەستێرە و داروبەرد هەر هەموویان یادی خوایان دەکرد، عەبادی کوری بیشر دەروونی هەڵچوو بۆ خواپەرستی و، ئارەزووی چووە سەر قورئان...
خۆشترین کاتی عەبادکە تێدا قورئانی دەخوێندەوە ئەو کاتە بوو لە نوێژدا بوو شیرناتی نوێژو شیرناتی خوێندنەوەی قورئانی لەیەک کاتدا کۆدەکردەوە...
رووی پیرۆزی لە قیبلە کرد و چووە ناو نوێژو سوورەتی (کەهف)ی بە دەنگە زوڵاڵ و شیرینەکەی دەخوێندەوە.
کاتێک عەباد کەوتبووە ناو رووناکی خودای گەورە، نقووم ببوو لە رووناکی مرواریەکەی، پیاوە هاوبەش پەیداکەرەکە پەیدا بوون و هەنگاوی دەهاویشت کاتێک

لەدوورەوە عەبادی بینی چەسپاوە لە دەمی دۆڵەکە ، زانی پێغەمبەر و یاوەرەکان لەناو دۆلەکەن و ئەم پیاوەش پاسەوانی ئەوانن ، تیرکەوانەکەی ئامادە کردو تیرێکی لەناو جۆرکەکەی پشتی دەرهێناو تیرەکەی بۆ هاوێشت و پیی کەوت ....

عەباد تیرەکەی لە جەستەی دەرهێناو بەردەوام بوو لە خوێندنی قورئان و لە نوێژ دڵی رۆیشتبووە دونیایەکەی ترو گفتوگۆ لەگەڵ خوای گەورە ...

پیاوەکە تیرێکی تری بۆ هاوێشت و ئەمیشی پی کەوت ، ئەمیشی دەرهێنا چۆن ئەوتری دەرهێنا ، تیری سێیەمی بۆ هاوێشت ، ئەویشی دەرهێنا چۆن ئەوانی تری دەرهێنا ، بە قونەخشکە رۆیشت تاکو گەیشتە هاورێیەکەی و ئاگاداری کردەوەو پیی گووت ..

هەڵسە برینەکان هێزی لی بریم .

کاتێک هاویەش پەیداکەرەکە هەردوو کیانی بینی هەڵات .

کاتێک عەمار بینی خوێنێکی زۆر لە هەر سێ برینەکەی عەباد دێت سۆزی بۆی هەڵساو پیی گووت :

ئەی (سبحان الله) نەدەبوو لە یەکەم تیری پێت کەوت ئاگادارم کەیتەوە ؟!

عەباد گووتی : من لەناو سورەتێک دا بووم حەزم نەدەکرد بیبرم تاکو تەواوی دەکەم سوێند بەخوا ئەگەر لە ترسی ئەم کەمتەرخەمی یە نەبووایە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردووم ئەم کەلێنە پڕ بکەمەوەو بیپارێزم لەت کردنی لەشم لەلا چاکتر بوو لە برینی نوێژەکە .

کاتێک جەنگی (الردە) هەڵگەڕاوەکان لە سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکر خوای لی ی رازی بێت دەستی پێ کرد ، ئیمامی ئەبو بەکر سوپایەکی گەورەی دروست کرد بۆ بن بڕکردنی ئاژاوەی موسەیلەمەی درۆزن و ، هەڵگەڕاوەکان مل کەچ بکەن بۆ فەرمانی خواو ، گێڕانەوەیان بۆ باوەشی ئیسلام ، عەبادی کوڕی بیشر لە پێشەنگی ئەم سووپایە دابوو .

عەباد لەسەرەتای جەنگەکە بینی مسوڵمانان سەرکەوتن مسۆگەر ناکەن ، لەبەر پشت بەستنی ئەنصارەکان بە موهاجیرەکان و ، پشت بەستنی موهاجیرەکان بە ئەنصارەکان ، دەروونی عەباد پڕ بوو لە خەم و توورەیی ، کاتێک گوێی لەم تانەو تەشەرە بوو لە یەکتر یان دەدا دەتگووت پشکۆ ئاگر و دڕک لە دڵی ڕادەچێت ....

دڵنیا بوو لەوەی مسوڵمانان سەرکەوتن وەدەست ناهێنن لەم جەنگە دژوارە تەنها ئەگەر ئەم دوو چینە لە یەکتر جیا نەبنەوە ، هەریەکەیان لێپرساوەتی خۆی هەڵبگرێت و ... موجاهیدە ئارام گرتووەکان بە ڕاستی بناسرێن ....

لە شەوێک لە شەوەکان کەوا ئەم جەنگە دژوارە بەردەوام بوو عەباد کوڕی بیشر لە خەودا بینی ئاسمان بۆی بۆوە ، کاتێک عەباد چووە ناویەوە دەرگای لەسەر داخرا ...

کاتێک بە ئاگا هات خەونەکەی بۆ (أبا سعيد الخدري) گێڕایەوە ....

عەباد گووتی :. سوێند بەخوا شەهادەتە نەی ( أبا سعید ) ....

کاتێک ڕۆژ داهات و جەنگ دەستی پێکردەوە ، عەباد کوڕی بیشر چووە سەر بەرزاییی یەک و هاواری کرد : ئەی کۆمەلی ئەنصار لەخەلک جیا ببنەوە .. کالانی شمشێرەکانتان بشکێنن ....

نەهێلن ئیسلام لەلای ئێوە شکستی بهێنێت .....

ئەم ئاگاداری یەی چەند جار دووبارە کردەوە تاکو چوارسەد موجاهید لە دەوروبەری کۆبۆوە لەنێوانیان ثابت کوڕی قەیس و بەرائی کوڕی مالک و ، ئەبو دوجانە خاوەنی شمشێری پێغەمبەری خوا ئامادە بوو :

عەباد کوڕی بیشر لەگەل ئەوانەی لە دەورەی کۆببونەوە بە شمشێرەکەی ڕیزەکانی دوژمنی بڕی و سینگی خۆی دا بەر تیرو شمشێری دوژمن ، تاکو هێزو وورەی سوپای موسەیلەمەی درۆزنی شکاند و موسەیلەمەو کۆمەلەکەی پەنایان بردە بەر (باخچەی مردن ) .

لێرەدا نزیک دیواری باخچەکە لاشەی عەباد کوڕی بیشر پیاوی مزگەوت و موجاهیدی گۆڕەپانی جەنگ بە شەهیدی کەوت و لە خوێنی پاکی جەستەی سوور بوو .
جەستەی عەباد هەموو جۆرە لێدانێکی پێکەوت لە لێدانی شمشێرو ڕم و تیر ....
تاکو وای لێهاتبوو نەیاندەناسیەوە تەنها بە نیشانەیەک کەوا لەسەر جەستەی هەبوو .
خوای گەورە لە شەهیدی قورئان خوێن و موجاهید عەبادی کوڕی بیشر وازی بێت...

٣٩

# عبدالله‌ی كوڕی سه‌لام

هه‌ر كه‌سێك حه‌زده‌كات ته‌ماشای پیاوێك
له‌خه‌ڵكی به‌هه‌شت بكات
با ته‌ماشای عبدالله‌ی كوڕی سه‌لام بكات

﴿٣٩﴾

# عبدالله‌ی كوڕی سه‌لام

## هه‌ر كه‌سێك حه‌زده‌كات ته‌ماشای پیاوێك له‌خه‌لكی به‌هه‌شت بكات با ته‌ماشای عبدالله‌ی كوڕی سه‌لام بكات

حوصه‌ین كوڕی سه‌لام زانایه‌ک بوو له زانا گه‌وره‌كانی جوله‌كه له (یـثرب)..... خه‌ڵكی به مه‌دینه وبه هه‌موو چین و توێژه‌كان و ئایینی یه‌كانیان ڕێزیـان لـی‌ی ده‌گرت و به گه‌وره‌یان ده‌زانی.... له ناو خه‌ڵک به ناوبانگ بووو ناسراو بوو به له‌خواترس و پیاو چاک به سیفه‌تی ڕاستگۆیی و ئیستیقامه .

حوصه‌ین ژیانێكی هێمن و ئاسووده‌یی به‌سه‌ر ده‌برد ، لـه هه‌مان كاتیشدا پیاوێكی دڵسۆزی سوود به‌خش و چاكه خوازبوو ... كاته‌كانی خۆی دابه‌ش كردبوو به‌سێ به‌ش :
به‌شێكی له دێر بۆ ئامۆژگاری و خواپه‌رستی ....
به‌شێكیشی له باغ خه‌ریک بوو به دارخورما به موتوربه‌و چاک كردن ..
به شه‌كه‌ی تری بۆ ته‌ورات بۆ تێگه‌یشتن له ئایین ...

هه‌ر كاتێک حوصه‌ین ته‌وراتی ده‌خوێنده‌وه ماوه‌یه‌كی زۆر له‌سه‌ر ئه‌م هه‌واڵه ده‌وه‌ست كه‌وا مزگێنی ده‌دا به به‌دیار كه‌وتنی پێغه‌مبه‌رێک له (مه‌كه) كۆتایی دێنـێ بـه پـه‌یامی پێغه‌مبـه‌ره‌كانی پێشـوو تـه‌واوی ده‌كـات ... لـه سیفه‌ته‌كانی ئـه‌م پێغه‌مبـه‌ره نزیكـه و نیشانه‌كانی ده‌كۆلیه‌وه‌و موچركی خۆشی به له‌شدا ده‌هات له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره له‌م شاره كۆچ ده‌كا كه‌وا تێیدا ده‌كرێت به پێغه‌مبه‌رو شاري (یـثرب) ده‌كـات بـه جێگـای كۆچ و نیشـنگه‌ی خۆی .. هه‌موو جارێک كه ئـه‌م هه‌واڵـه‌ی ده‌خوێنـده‌وه یـان پێیـدا ده‌رۆیشت هیوای ئه‌وه‌ی ده‌خواست له خوای گه‌وره كه‌وا ده‌رفه‌تی بدات لـه ته‌مـه‌نی تـاكو به‌دیاركه‌وتنی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره نزیكه ببینێت و كه‌یف خۆش بێت بـه گه‌یشـتنی و ببێـت بـه یه‌كه‌مین بڕوادار بڕوای پێ بهێنێت .

خودای گه‌وره دوعاكانی حوصه‌ینی كوڕی سه‌لامی گیرا كردو ته‌مـه‌نی درێژ كرد تـاكو خودای گه‌وره پێغه‌مبه‌ری ڕه‌حمه‌ت و مزگێنی ده‌ری ڕه‌وانه كرد ... خودا بۆی نووسـی بـه خزمه‌تی ئه‌م پێغه‌مبه‌ره بگات و ، بڕوا بهێنێت به‌و ئایینه هه‌قه‌ی كه بۆی ڕه‌وانه كراوه.

با چیرۆكی مسوڵمان بوونی حوصـه‌ین هـه‌ر بـۆ خـۆی لـی بگـه‌ڕێن چونكـه ئـه‌و باشـترو به‌تام تر بۆمان ده‌گێڕێته‌وه ، چونكه له‌به‌سه‌ر هاته‌كه شاره‌زایه .

حوصه‌ین كوڕی سه‌لام ده‌ڵێت :

كاتێک گوێم لی بوو پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به‌دیار كه‌وتووه ، لـه‌ناوو بنه‌ماڵـه‌و سیفه‌ت وكـات و شـوێنم ده‌كۆلیـه‌وه به‌رامبـه‌رم ده‌كـرد لـه‌گـه‌ڵ ئـه‌وه‌ی لـه‌لای ئێمـه نووسـراوه لـه په‌رتووک تاكو دڵنیا بـووم لـه پێغه‌مبه‌رایه‌تیه‌كه‌ی و ، بـه تـه‌واوی لـه ڕاسـتی بانگه‌كه‌ی

گەیشتم ، پاشان ئەمەم لە جولەکەکان شاردەوەو ، زمانی خۆم گرت لە باسکردنی
تاکو ئەم ڕۆژەی کەوا تێیدا پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد لە مەکە بە نیاری ... بە قوبائی
گەیشتە (یثرب) لە (قبـاء) دابەزی پیاوێک گەیشتە لامان بانگی هەڵکەوەی کرد و
هاتنی پێغەمبەری ﷺ ئاشکرا کرد .
من لەم کاتە خەریکی دارخورمایەک بووم کارم تیا دەکرد ، خالدەی کچی حارسی
پوورم لە ژێر دارێک دانیشتبوو ، هەر کە ئەم هەواڵەم گوێ لێ بوو هاوارم کرد : الله
أكبر ...... الله أكبر .
کاتێک پوورم گوێی لەم تەکبیرانە بوو پێی گووتم : خوا ڕووت ڕەش کا ...... سوێند
بە خوا گوێت لێ با بەهاتنی موسای کوڕی عیمران لەمەزیاتر شتێکی وات نەدەکرد . .
منیش پێم گووت : ئەی پوورە ، ئەمە سوێند بە خوا ـ برای عیمران و ، لەسەر ئایینی
ئەمە ....
ئەوەی بۆ ئەو ڕەوانە کراوە بۆ ئەویش ڕەوانە کراوە ....
بێ دەنگ بوو و گووتی :
[ ئایا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئێوە هەواڵتان داینێ ئەو پێغەمبەرەی کەوا
پێغەمبەرەکانی پێش خۆی بەڕاست دادەنێ و تەواوکەری پەیامەکانی پەروەردگارە ؟!
پێم گووت : بەڵێ ....
گووتی : کەواتە خۆیەتی ....
پاشان هەنگاوم هاوێشت بەبێ دواکەوتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بینیم خەڵک
قەلەبالغیان کردووە لە پێش دەرگای ، هەولم دا تاکو لێی نزیک بوومەوە .
یەکەم شت کە گوێم لێ بوو لێی دەیفەرموو :
ئەی خەڵکینە ئاشتی بلاوبکەنەوە . .
نانی هەژاران بدەن .... بەشەو نوێژ بکەن لە کاتێک خەڵک خەوتبن ... بە ئاسانی
دەچنە بەهەشت ....
بەچاو دیقەتم دەدایێ و چاوم لێ نەدەبڕی لە تەمەشا کردن ، دڵنیا بووم لەمەی
ڕوخساری بە درۆزن ناچێت .
پاشان لێی نزیک بوومەوە ، شاهێدیم دا بە [ اشهد ان لا الـه الا الـه وأن محمدا رسول
الله ] .
ڕووی لێ کردم و فەرمووی :
ناوت چی یە ؟
گووتم : حوصەین کوڕی سەلام
فەرمووی : بەڵکو عبدالله کوڕی سەلام .
پێم گووت : بەڵێ ، عبدالله کوڕی سەلام ... سوێند بەو کەسەی تۆی بەهەق ڕەوانە
کردووە ، پاش ئەم ڕۆژە حەز ناکەم بە هیچ ناوێکی تر بێجگە لەمە . . پاشان ڕۆیشتم لە

خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماڵەوە ، بانگهێشتی خێزان و منداڵ و کەس و کارم کرد بۆ ئیسلام ، هەموویان مسوڵمان بوون و پوورم (خالدة)ش لەگەڵیان موسڵمان بوو ، کەوا پیرێکی بەتەمەن گەورە بوو ...
پاشان پێم گوتن : مسوڵمان بوونی من و موسڵمان بوونی خۆتان لە جولەکان بشارنەوە تاکو رێگاتان دەدەم .
گووتیان : بەڵێ پاشان گەڕامەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم گووت :
ئەی پێغەمبەری خوا ، جولەکە میللەتێکی درۆ هەڵبەستەو ناهەقن ... من حەز دەکەم گەورە پیاوەکانیان بێن بۆ لات ... من خۆم لێیان دەشارمەوە لە ژوورێک لە ژوورەکانت پاشان پرسیاریان لی بکە سەبارەت بە پلەو پایەم لە لایان پێش ئەوەی بزانن مسوڵمان بوومە پاشان داوایان بکە بۆ ناو ئیسلام .... ئەمانە ئەگەر بزانن مسوڵمان بوومە قسەم لەسەر دەکەن ، تانەم لی دەدەن بە هەموو نەنگی پەک و درۆم پی هەڵدەبەستن ...
پێغەمبەری خوا ﷺ دانیام لە ژوورێک لە ژوورەکانی ، پاشان داوای لی کردن بێن بۆ لای هانیان بدات بۆ ئیسلام و ئیمانیان لەلا خۆشەویست بکات ، ئەمەیان بە یادبهێنێتەوە کەوا زانیتیان لە پەرتووکەکەیان سەبارەت بە ئیسلام ... هاتنە لای گفتو گۆی ناهەقیان لە گەڵ کردو ، دژایەتیان لەگەڵ کرد لەسەر هەق ، منیش گوێم لی‌یان بوو ، کاتێک پێغەمبەر نائومێد بوو لە بڕوایان پی‌ی فەرموون :
پلەو پایەی حوصەین لەناو ئێوە چی‌یە ؟
گووتیان : گەورەو کوڕی گەورەمانەو مامانەو زانامانەو کوڕی مالم و زانامانە ، پی‌ی فەرموون :- ئەگەر بینیتان بووە مسوڵمان ئایا ئێوە مسوڵمان دەبن ؟
گووتیان :حاشا للە ، نابێت بە موسڵمان .. خوا بیپارێزی لەوەی ببێت بە موسڵمان لێیان دەرچوومە دەرەوە و پێم گووتن : ئەی کۆمەڵی جولەکە ، لە خوا بترسن و پێشوازی لەمە بکەن کە موحەممەد هێناویەتی سوێند بە خوا ئێوە دەزانن ئەمە پێغەمبەری خوایەو ، دەزانن و بینیوتانە لەلاتان لە تەورات ناو وسیفاتەکانی نووسراوە

گووتیان درۆت کرد .. سوێند بە خوا تۆ خراپترین کەسی ئێمەی و کوڕی خراپترین کەسی ، نەزانی ئێمەی و کوڕی نەزانی ئێمەی ، هیچ نەنگیەکیان نەهێشت هەموویان پی گووتم .
بە پێغەمبەری خوام ﷺ گووت: پێم نەگووتیت: جولەکە نەتەوەیەکی درۆ هەڵبەستەن و ناهەقن ، ئەمانە خاوەنی ستەم و خراپەکارین ؟!
عبداللە کوڕی سەلام پێشوازی لە ئیسلام کرد هەروەک تێنوویەک عەودالی ئاو پەیدا کردن بێت ....
عبداللە بوو بە شەیدای قورئان ، زمان و لێوەکانی تەڕنەدەکرد تەنها بە ئایەتە

ڕوونەکانی قورئان نەبێت . . .
بە جۆرێکی وا بە پێغەمبەرەوە بەند بوو ﷺ هەتا وای لێهات لەگەڵ سێبەری دەڕۆیشت.
دەروونی خۆی تەرخان کرد بۆ کارکردن بۆ بەهەشت تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ مزگێنی پێداو ئەم مزگێنی‌یە بڵاوەی کرد لە نێو یاوەرە بەڕێزەکان . . . .
بۆ ئەم مزگێنی یە (قەیس کوڕی عوبادە) مزگێنی ئەم چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە . . هەروەها ئیتریش دەیگێڕنەوە . . .
(قەیس کوڕی عوبادە) دەڵێت :
من دانیشتبووم لە بازنەیەک لە بازنەکانی زانست لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە ، لەم بازنەیەدا پیرێکی لەناو بوو دڵ و دەروون بۆی شەیدا دەبوو . . . ئەم پیرە و تارێکی دا بۆ خەڵکەکە بە ویقارێکی شیرین و بەجۆش . . . .
کاتێک هەڵسا خەڵکەکە گووتیان :
هەر کەسێک حەز دەکات تەماشای پیاوێکی خەڵکی بەهەشت بکات تەماشای ئەمە بکات . . .
گووتم : ئەمە کێ‌یە ؟!
گووتیان : عبداللەی کوڕی سەلام
لە دڵی خۆم گووتم : سوێند بەخوا بەدوای دەکەوم ، بە دوای کەوتم ڕۆیشت تاکو لە مەدینە چووە دەرەوە ، پاشان گەیشتە ماڵەوە .
داوای ڕوخسەتم لێ‌ی کرد ، ئەویش ڕێگای دام .
گووتی : چیت دەوێت ئەی کوڕی برام ؟
گووتم : گوێم لە خەڵک بوو دەربارەت دەیانگووت . کاتێک لە مزگەوت چوویە دەرەوە: هەر کەسێک حەز دەکات تەماشای پیاوێک لە خەڵکی بەهەشت بکات با تەماشای ئەمە بکات : بە دوات دا هاتم ، بۆ ئەوەی لە هەواڵت بزانم و ، بزانم خەڵک چۆن ئەمەی زانی یە تۆ خەڵکی بەهەشتیت . . .
گووتی : خوا دەزانێت بە خەڵکی بە هەشت ئەی کوڕم .
گووتم : بەڵێ . . . بەڵام دەبێت هۆیەک هەبێت بۆ ئەوەی گووتیانە .
گووتی : هۆیەکەت بۆ دەگێڕمەوە .
گووتم : دەی . . . خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە .
گووتی : شەوێک لە شەوان خەوتبووم لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک هاتە لام و پی‌ی گووتم : هەڵسە ، منیش هەڵسام ، دەستی گرتم ، کاتێک من ڕێگای چەپەم گرت ویستم پی‌ی دا بڕۆم . . . .
پی‌ی گووتم : واز لەم ڕێگایە بهێنە ، ئەمە ڕێگای تۆ نیە . . . تەماشام کرد بە ڕێگایەکی ڕوون دا دەڕۆم لە ڕاستەم . .
پی‌ی گووتم : ئەم ڕێگایە بگرە . . .

ڕێگام گرت تاکو چوومە ناو باخچەیەکی پان و بەرین و فرەوان ... باخچەیەکی زۆر سەوز و سەرنج ڕاکێشەر بوو .
عەمودێکی ئاسن لە زەوی چوو بووە خوارەوەو کۆتایی یەکەی لە ئاسمان بوو ...
لەسەرەوەی بازنەیەکی زێڕهەبوو
پێی گووتم :- پێی هەڵگەڕێ
گووتم : ناتوانم
خزمەتکارێک هات بڵندی کردمەوە ، بەسەر کەوتووم تاکو گەیشتمە بەرزترین شوێن لە عەمودەکە ، بازنەکەم بەهەردوو دەست گرت ... بە بازنەی عەمودەکە مامەوە تاکو لەخەو هەڵسام ، کاتێک بەیانی داهات چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ خەونەکەم بۆ گێڕایەوەو فەرمووی :
ئەم ڕێگایەی کە بینیبووت لەلای چەپە ئەمە ڕێگای خاوەن چەپەکانی خەڵکی ئاگرە ..
بەلام ئەم ڕێگایەی بینیبووت لەلای ڕاستە ئەم ڕێگایە ڕێگای خاوەن ڕاستەکانی خەڵکی بەهەشتە .
هەرچی ئەو باخچەی سەرنجی ڕاکێشا بووی بەسەوزایی یەکەی و جوانیەکەی ئەمە ئیسلام بووە ..
ئەم عەمودەی کەوا لە ناوەڕاستەکەی بوو ئەمە کۆڵەگەی ئایین بووە ......
بەلام بازنەکە ئەمە ترۆپکی ئایین بووە ....
هەر بەم ئایینە پابەند دەبیت تاکو دەمریت ...
خوای گەورە ڕازی بێت لە یاوەری بەڕێز و خۆشەویست عبداللەی کوڕی سەلام خوا لە بەهەشتی پان و بەرینی خۆیدا شادمان بکات ....

٤٠

# فەیروزی دەیلەمی

پیاوێکی پیرۆز
لە بنەماڵەیکی پیرۆز

# فەیروزی دەیلەمی

## پیاوێکی پیرۆز لە بنەماڵەیکی پیرۆز

کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ پاش گەڕانەوەی لە حەجی ماڵ ئاوایی نەخۆشی تینی بۆ هێنا ، هەوالی نەخۆشیەکەی لەسەر تاسەری دوورگەی عەرەبی بڵاوەی کرد ، ئەسوەدی عەنەسی لە یەمەن و ، موسەیلەمەی درۆزن لە یەمامەو ، تولەیحەی ئەسەدی لە وڵاتی (بني أسد) ، لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو ، ئەم سێ بەدکارە درۆزنە خۆیان وانیشان دا لەناو میللەتەکەیان کەوا پێغەمبەرن هەروەک موحەممەدی کوڕی عبدالله ناردراوە بۆ قورەیش .

ئەسوەدی عەنەسی جادوکەرێکی تەڵەکەبازی دەروون ڕەش بوو کردەوە خراپەکانی بە ئاشکرا بوو ، پیاوێکی بەهێزی ، بەژن و باڵا گەورە بوو ....

لەگەڵ ئەمەشدا پیاوێکی قسە ڕەوان بوو بە قسەکانی بیری خەڵکی بۆ خۆی ڕادەکێشا .... فێڵبازێکی ئەوەندە بەتوانا بوو یاری بەبیری خەڵکە ڕەشۆکیەکەی دەکرد بەهۆی قسە درۆدەلەسەکانی و ، سەرنج ڕاکێشانی گەورە پیاوەکانیش بەهۆی ماڵ و پلەو پایە .... بەجۆرێکی وا خۆی بەخەڵک نیشان دەدا ڕووپۆشێکی لەدەم وچاوی خۆی دەکرد بۆ ئەوەی لە ژێر پەردەوە ڕوخسارە ڕاستەقینەکەی خۆی بزر بکات و هێزو هەیبەت بنوێنێت ...!!

لەم سەردەمەدا دەسەڵات لە یەمەن لە ژێر دەستی (أبناء) ەکان بوو ، لە سەرەوەی هەموویان (فەیروزی دەیلەمي) یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ... (أبناء) ناوێک بوون لە کۆمەڵێک خەڵک باوکیان فارس بوو کەوا لە وڵاتی خۆیان کۆچیان کردبوو بۆ یەمەن ، دایکیشیان لە عەرەبەکان بوون ..... گەورەیان ناوی (باذان) بوو لەکاتی پەیدا بوونی ئیسلام پادشا بوو لەسەر یەمەن لەلایەن کیسرای پادشای فارسەکان ، کاتێک ڕاستی پێغەمبەرایەتی موحەممەدی ﷺ بۆ بەدیار کەوت و بانگەکەی بەرز بۆوە وازی لەگوێڕایەڵی کیسرا هێناو خۆی و میللەتەکەی هاتنە ناو ئایینی خوا ....

پێغەمبەر ﷺ هێشتیەوە لەسەر دەسەڵات ، دەسەڵاتدار مایەوە تاکو پێش هاتنی ئەسوەدی عەنەسی بەماوەیەکی کورت مرد .

یەکەم کۆمەڵ بەپیر بانگەکەی ئەسوەدی عەنسی هاتن هۆزەکەی بوو بەناوی [بنو مذحج] ، پەلاماری (صنعاء) ی پێ دان و ، فەرمانڕەواکەی (شهر) کوری باذان کوژراو ، خێزانەکەی بە ناوی (آذاد) لە خۆی مارە کرد ....

پاش گرتنی (صنعاء) پەلاماری ناوچەکانی تری داو ، بە ماوەیەکی کورت بەهۆی

لێدانەکانی هیچ شوێنێک خۆی لەبەر ڕانە دەگرت تاکو ئەم وڵاتانەی دەکەونە نێوان حضرموت تاکو طائیف و ، نێو بەحرێن و ئەحساء تاکو عەدەن مل کەچی بوون . . . .

ئەوەی یارمەتی ئەسوەدی عەنسی دا لەسەر ئەوەی فێڵ لە خەڵک بکات وبۆ خۆیانی ڕابکێشی و بەهۆی ئەم زۆرزانیەی کەوا سنووری نەبوو ، وای نیشان دەدا بەرامبەر شوێن کەوتووەکانی کەوا پادشایەکەو نیگای بۆ دێتە خوارەوەو بەنهێنی یەکان ئاگادار دەکرێتەوە . . . .

ئەم فێڵ و تەڵەکانەی خۆی دەچەسپاند بەهۆی هەواڵگرەکانی (جواسیس) کەوا پەرش و بڵاوی کردبوونەوە ، بۆ ئەوەی بەهەواڵەکانی بزانن و بچنە ناو نهێنی یەکانیان و ، بە تەنگ و چەڵەمەکانیان و بەدڵ و مەبەستەکانیان بزانن ، پاشان بێنە لای ئەسوەدی عەنسی پێش ئەوەی ئەوان باسی تەنگ و چەڵەمەکانیان بکەن بە پێشیان بکەوێت

ئینجا هەر کاتێک یەکێک دەهاتە لای بۆ پێویستی یەک و ئەسوەدی عەنسی بە پێشی دەکەوت و باسی گیرو گرفتەکەی بۆ دەکرد ، وای لە شوێن کەوتووەکانی کردبوو تووشی هەڵوێستی سەیرو سەمەرە ببن سەریان سووڕ بمێنێ لەم کارانەی تاکو کارەکەی جێ ی خۆی گرت و ، بانگەکەی پەرەی سەند چۆن ئاگر لە پووشی ووشک دەئاڵێ و دەیسوتێنێ . . .

هەرکە هەواڵی هەڵگەڕانەوەی ئەسوەدی عەنسی گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ پەلاماری بۆ سەر یەمەن ، پێغەمبەر ﷺ دە یاوەر لە یاوەرە بڕوا پێ کراوەکانی کەوا باشترین یاوەری پێشووی بوون لە یەمەن بە کاغەز ئاگاداری کردنەوە . . . تێیدا هانی دان بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەم فیتنە کوێرانە بە ئیمان و ئایینی خوا ، فەرمانی پێ دان بۆ ڕزگار بوون لە دەست ئەسوەدی عەنسی بەهەر ڕێگایەک بێت .

هەر یەکێک لەم یاوەرانە نامەی پێغەمبەرەکەی دەگەیشتێ ئەوا گوێ ڕایەڵ دەبوو بۆ بانگەکەی و هەڵدەستا بە جێ بە جێ کردنی فەرمانەکەی . . . . نزیکترین کەس بۆ بە پیر هاتنی داواکەی قارەمانی داستانەکەمان فەیروزی دەیلەمی بوو لەگەڵ یارمەتی دەرەکانی لە (أبناء)ە کان . . . .

ئەم قسەیەش با واز بهێنین بۆ فەیروز خۆی کەوا قارەمانی دەستانەکەیەو گوێ ی لی ڕابگرین . . . . فەیروز دەڵێت :

من و ئەوانەی لەگەڵم بوون لە (أبناء) ە کان یەک سات گومانمان نەبوو لە ئایینی خوا ، هیچ دان هێنانێک بە دوژمنی خوا لە دلمان جێ ی نەگرت . . . . کاتێک هەر یەکێک لە یاوەرە دێرینەکان لە بڕواداران نامەی پێغەمبەری خوامان ﷺ پێ گەیشت پەیوەندیمان بە یەک کردو هەر کەسە لە لای خۆی کاری کرد . . . .

کاتێک ئەسوەدی عەنەسی لە کارەکانی سەرکەوتنی هێنا فیزو لە خۆبایی بەرۆکی گرت ، فیزی لەسەر فەرماندەی سوپا (قەیس کوڕی عەبدی یەغوث) لی دەداو

فەرمانی لەسەر دەکرد ، هەڵسو کەوتەکانی لەگەڵی گۆڕا تاکو وای لی هات قەیس بەهۆی دەست درێژیەکانی لە خودی خۆی دڵنیا نەبێت ....
من و ئامۆزاکەم (داذویە) ڕۆیشتینە لای و نامەی پێغەمبەری خوامان ﷺ پێگەیاند ، داوامان لی کرد خواردنی نیوەڕۆی دەرخوار بدات پێش ئەوەی ئەو خواردنی عیشای دەرخوارد بدات ...
هەر سێ مان پەیمانمان دا بۆ ئەوەی بەرەنگاری ئەم هەڵگەڕاوە درۆزنە ببینەوە لە ناوەوەو برایاتیشمان لە دەرەوە بەرەنگاری ببنەوە ....
بیروڕاشمان وابوو کچی مامم (داذا) هاویەشیمان لەگەڵ بکات کەوا ئەسوەدی عەنەسی پاش کوشتنی مێردەکەی (شەهری کوڕی باذان) لە خۆی مارە کردبوو ...
ڕۆیشتمە لای کۆشکی ئەسوەدی عەنەسی گەیشتم بە کچە مامەکەم (داذا) پێم گووت :ـ ئەی کچە مام ، هەروەک خۆت دەزانی ئەم پیاوە چی کرد بە تۆو بە ئێمە لە خراپەو زیان

ئەم پیاوە مێردەکەتی کوشت و ، سووکی کرد بە ئافرەتانی میللەتەکەت ، زۆر پیاوەکانی بە فەوتان داو ، دەسەڵاتی لە ژێر دەستیان دەرهێنا
ئەمەش نامەی پێغەمبەری خوایە ﷺ بە تایبەتی بۆ ئێمە و بە گشتی بۆ خەڵکی یەمەن بە گشتی داوامان لی دەکات بۆبن بڕ کردنی ئەم فیتنەیە ....
ئایا دەتوانی لەسەری یارمەتیمان بدەیت ؟!
گووتی : لەسەر چی یارمەتیتان بدەم ؟
گووتم : لەسەر لابردنی ....
گووتی : بەڵکو لەسەر کوشتنی ....
گووتم : سوێند بەخوا لەمە زیاتر مەبەستم نەبووە ، بەڵام ترسام ڕاستەوخۆ پێت بڵێم...
کچەکە گووتی : سوێند بەو کەسەی موحەممەدی بەهەق و مزگێنی دەرو ترسێنەر ڕەوانە کردووە بەقەدەر چاو تورکانێک ئەم کابرایە نەیتوانیوە گومان لەدڵی من دروست بکات ، خوا هیچ مرۆڤێکی دروست نەکردووە ئەوەندە ڕقم لی‌ی بێت وەکو ئەم شەیتانە.
سوێند بەخوا هیچ شتێکم لی‌ی نەزانیوە لەم ڕۆژەی بینیومە بێجگە لە جوێن فرۆشتن و گوناه نەبێت ، نەرەچاوی هەق دەکاو نەواز لە خراپە دێنێت ...
پێم گووت چۆن وا بکەین بیکوژین ؟!
گووتی : ئەم کابرایە بە ئاگاو چاوکراوەیە بۆ خۆی و ، هیچ شوێنێک نیە لە کۆشکەکەی ئەوا ، پاسەوان دەورەی داوە تەنها ئەم ژوورە لابەلا چۆڵە نەبێت ، پشتەوەی لەم شوێنە بۆ ئەو شوێنە بەرەلایە ، ئەگەر هاتنە ناوی کونی بکەن لە تاریکی شەوا ، لە ناوەوەی چەک و ڕووناکی دەبینن منیش چاوەڕوانتان دەکەم ، پاشان لی‌ی وەرنە ژوورەوەو بیکوژن ...
گووتم : بەڵام کون کردنی ئەم شوورە لە کۆشکی ئاوەها کارێکی ئاسان نیە ... یەکێک

بەلامان دا تێدەپەڕێ و بانگ دەکا و هاوار دەکات بۆ پاسەوانەکان . . . ئینجا نەنجامی کارەکانمان باش نابێت .
گووتی : ئەمانەی گووتت هەمووی ڕاستە ، بەلام بیرورایەکم بۆت هەیە .
گووتم : ئەمە چی‌یە ؟
گووتی : بەیانی پیاوێک دەنێریت تێی دەگەیەنیت لەسەر شێوەی کرێکارێک ، فەرمانی پێدەدەی بە کون کردنی ژوورەکە لە ناوەوە تاکو کون بەدەر کردنەکە شتێکی کەمی دەمێنێت . . . پاشان ئێوە لە شەودا لەدەرەوە بەماندوو بوونێکی کەم تەواوی دەکەن .
گووتم :. باشترین بیرورایە ، بیرورای وام نەبینیووە .
پاشان ڕۆیشتم هەوالم دا هاوڕێکانم بەوەی لەسەری ڕێکەوتین ئەوانیش پیرۆز باییان لی کردم ، هەر لەم کات و ساتەدا خۆمان بۆ ئەم کارە ئامادە کرد . پاشان هەوالمان دا بڕوادارە بڕواپێکراوەکان لە یاریدەدەرەکانمان بە ووشەیەکی نهێنی ، داوای ئامادەییمان لی کردن ، بەلێنمان دا بە یەکتر بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر . . . .
کاتێک شەومان بەسەردا هات ، کاتی دیاری کراو هات لەگەڵ هاوڕێکەم ڕۆیشتین بۆ شوێنی کون کردنەکە و ژوورەکەمان لی بەدیار کەوت ، چووینە ناو ژوورەکەو دەستمان دا چەکەکان و چراکانمان پێ کرد ڕۆیشتینە جێگای دوژمنی خوا ، بینیمان کچە مامەکەم وەستاوە لەسەر دەرگاکە ، ئاماژەی بۆ کردم و چووینە ژوورەوە ، دوژمنی خوا نووستبوو و لە پرخەی خەودا بوو .
بە چەقۆکە پەلاماری قوڕگیم داو ، دەنگی گای لی بڵند بوو ، پەلەکانی هاوێشت وەکو حوشترێکی سەربڕا .
کاتێک پاسەوانەکان گوێیان لە بۆڕە بوو ، هاتنە لای کۆشکەکەو . . . . . . .
گووتیان : ئەمە چی‌یە ؟!
کچە مامەکەم پێی گووتن :
بڕۆن بلاوە بکەن خوا ئاگادارتان بێت ، پێغەمبەری خوا نیگای بۆ دێت . . .
ئەوانیش ڕۆیشتن . . . .
لە کۆشکەکە ماینەوە تاکو بەیانی داهات ، لەسەر دیوارێک لە دیوارەکان وەستام و بانگم دا : ألله أكبر ، ألله أكبر ، بەردەوام بووم لە بانگدان تاکو گووتم :. أشهد أن لا إلا الله وأشهد أن محمدا" رسول ألله وأشهد أن الأسود الاعنسي كذاب .. ، ئەمەش ووشەی نهێنیمان بوو . . .
مسولمانان لە هەموو لایەکەوە بۆ کۆشکەکە هاتن ، پاسەوانەکان بە ترس و لەرزە پەلاماریان دان کاتێک گوێ یان لە بانگەکە بوو هەردوو چینەکە بەیەکیان دادا .
منیش سەری ئەسوەدی عەنەسیم لەسەر دیواری کۆشکەکە بۆ هاوێشتن . .
کاتێک پیاوەکانی ئەمەیان بینی ورەیان بەرداو هێزیان لی بڕا هەروەها بینیان

بڕواداره‌کان ته‌کبیر له‌سه‌ر دوژمنه‌کانیان لی ده‌ده‌ن و ، کاره‌که ئه‌نجام درا پێش ڕۆژهه‌ڵات .

کاتێک ڕۆژ بریسکایه‌وه نامه‌یه‌کمان ڕه‌وانه کرد بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ بۆ مزگێنی له‌ناو چوونی دوژمنی خوا ، کاتێک مزگێنی ده‌ره‌کان گه‌یشتنه مه‌دینه بینیان پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ له‌م شه‌وه‌دا کۆچی دوایی کردووه .

به‌ڵام پاش ئه‌وه‌ی مانه‌وه زانیمان نیگا مزگێنی به پێغه‌مبه‌ر داوه به کوشتنی ئه‌سوه‌دی عه‌نسی له‌م شه‌وه‌ی که تێیدا کوژراوه ...

پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ به یاوه‌ره‌کانی گووت :

ئه‌سوه‌دی عه‌نه‌سی دوێنێکه کوژرا ...

پیاوێک کوشتی پیاوێکی پیرۆز له بنه‌ماڵه‌یه‌کی پیرۆرز بوو ...

پێیان گووت : ئه‌مه کێ‌یه ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ؟

گووتی :

فه‌یروز ....

فه‌یروز سه‌رکه‌وت ....

---

تێبینی / به پشتیوانی و یارمه‌تی خوا چاوه‌ڕوانی به‌رگی سێیه‌م بن (انشاء الله تعالى) ....

# ناوەڕۆك